

# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە ١٠

(ئـادار) ی ٢٠٠٦

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات

www. ...om







- کردنەوەی پرۆژەی کتێبخانەی ئەلکترۆنی لە کتێبخانەی گشتی هەولێر.
- چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەنتەرنێتی ئاریافۆن.
- چۆن خێرایی ئەنتەرنێتەکەت زیاد دەکەی بەبێ بەرنامە.
- گۆڕینی پاسووۆرد لە پۆستی ئەلکترۆنی یاهوو .

هەولێر ـ ٢٠٠٦



پاشکۆی گۆڤار : سی دی تایبەت بە گۆڤارەکە

## پەیامی سەرنووسەر

Aras_co_center@yahoo.com

# ڕێنمایی بۆ فێربوونی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر

خوینەری بەرێز هەموومان لەوە بێ گومانین کە ئامێری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت و بەرنامەکانی کۆمپیوتەر وەکو دەریایەکی گەورەیە و چەند بەدوابیدا بڕۆین فراوانتر دەبێت بۆیە ئەگەر بیر لەوە بکەینەوە کە لە ناو ئەو دەریایەدا فێری هەموو شتەکان بین یانیش هەموو ئەو پرۆگرامانە بەکار بێنین کە بۆ ئامێری کۆمپیوتەر دروست کراون ئەوە سەرمان لێ دەشێویت و ناتوانین بگەینە ئە نجام، ئەوەی من مەبەستمە لێرەدا ئاماژەی پێ بکەم و باسی لێوە بکەم ئەوەیە کە ئێمە ناتوانین لە یەك کاتدا و لە ماوەیەکی کەم هەموو بەرنامەکانی کۆمپیوتەر فێر بین و بەکاریان بێنین چوونکە بە سەدان و بگرە بە هەزاران بەرنامەی تایبەت بە کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت هەیە ئێمە چۆن دەتوانین ئەو هەموو بەرنامانە فێربین و بەکاریان بێنین کە هەر یەکێك لەو بەرنامانە کارێکی تایبەتی ئە نجام دەدات و بوارێکی جیاوازی هەیە لەگەڵ بەرنامەکانی تردا بەڵکو دەبێت بە ژیری مامەڵە لەگەڵ ئەو ئامێرە بکەین تا بتوانین باشترین سوودی لێ وەربگرین و سەریش لە خۆمان نەشێوێنین ئینجا بۆ ئەو مەبەستە دەتوانم بڵێم هەر کەسێك بیەوێ سوود لە بەرکارهێنانی بەرنامەیەك یان بەشێك لە کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت وەر بگرێ ئەوا دەتوانێ هەنگاو بە هەنگاو ئەو کارە بکات و باشترین ڕێگاش بۆ سەرکەوتن ئەوەیە کە بەکار هێنەری ئەو ئامێرە دەبێت بوارێك هەڵبژێرێت و تەنها لەو بوارەدا کار بکات و خۆی بۆ فێربوونی ئامادە بکات کە ئێستا دەیان سەرچاوەی باش هەیە بۆ فێربوونی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت هەر لە سیدی و کتێب و بەرنامەی تەلەفزیۆن و ماڵپەرە فێرکاریەکانی ئەنتەرنێت و گۆڤار و تەنانەت ڕۆژنامەکانیش ئێستا گرنگی دەدەن بە بەشەکانی فێرکاری تایبەت بە کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت و دوای فێربوونی ئەو بوارەی کە هەڵتبژاردوە دەتوانی بە شێوەیەکی سەرکەوتوانە ئەو بەرنامەیە بەکار بێنیت . بوارەکانی کۆمپیوتەریش زۆرن بۆ نموونە لە بواری دیزایندا بەرنامەی زۆر باش هەن لەوانە بەرنامەی ئەدۆب فۆتۆ شۆپ ، لە بواری ئەندازیاری بەرنامەی ئۆتۆ کاد ، لە بواری سینەما بەرنامەی ماکس ، لە بواری مۆنتاژ و دۆبلاژ بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ برۆ ، لە بواری نەخشە سازی ماڵپەرەکانی ئەنتەرنێت بەرنامەی فرۆنت پەیج ، لە بواری نەخشە سازی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بەرنامەی ئەدۆب ئیندزاین ، لە بواری پرۆگرام سازیەوە ڤیژواڵ بێسك ، لە بوارەکانی نووسین و خشتە و کلێشە سازیەوە بەرنامەکانی مایکرۆسۆفت ئۆفیس کە وۆرد و ئەکسل و ئەکسیس دەگرێتەوە. لە هەموو بوارێکدا چەندین بەرنامەی تایبەتی باش هەن کە بەکارهێنەری کۆمپیوتەر دەتوانێت سوودی لێ وەربگرێت ئەوانەی کە لەسەرەوەش باسم کردن تەنها نموونەی ئەو بوارانە بوون کە بێ جگە لەو بەرنامانەی کە باسم کردن بۆ هەر بوارێك چەندین بەرنامەی باشی تر هەن کە سوود بەخشن و بەکار هێنەر دەتوانی بەکاریان بێنێ بەڵام بەو مەرجەی کە تێکەڵ بە بەرنامەیەکی تر نەبێت تا ئەو بەرنامەیەی کە هەڵی بژاردووە بە باشی فێری دەبێت ، واتا ئەگەر خەریکی فێربوونی بەرنامەی فۆتۆ شۆپ بوویت وازی لێ مەهێنە تا بە باشی فێری دەبیت و بیکە بە بواری تایبەتی خۆت بۆ ئەوەی هەر لەو بوارەدا بە شێوەیەکی شارەزا و لێ هاتووی کار لەسەر ئەو بەرنامەیە بکەیت و ئینجا دوای ئەوە ئەگەر بۆ حەزی خۆت ئارەزووی فێربوونی بەرنامەیەکی ترت کرد ئەوا هەوڵ بۆ فێربوونی بدە . بەو شێوەیە دەتوانن سەرکەوتن بە دەست بێنن لە بەکار هێنانی هەر بەرنامەیەك کە بتانەوێت بە باشی بەکاری بێنن .

# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە
10
ئاداری 2006

گۆڤارێکی مانگانەیە تایبەتە بە کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت - وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات




تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت


## ناونیشان

هەرێمی کوردستانی عێراق / هەولێر . دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری . شەقامی شەست مەتری نزیک هۆڵی زەرد
بۆ هەر پێشنیار و تێبینی و سەرنجێك دەربارەی گۆڤارەکە یان ناردنی بابەتێك . پەیوەندی بکەن
بەم ناونیشانە : دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری . بەڕیوبەرایەتی کۆمپیوتەر . یان بە ژمارە تەلەفۆنی
2527054 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی

Email : aras.co.center@yahoo.com


## تێبینی :

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە بابەت ئەنێرن بۆ گۆڤاری کۆمپیوتەر تکایە ڕەچاوی ڕێسای نووسین بکەن لەسەر کۆمپیوتەر بە دانانی خاڵبەندی نووسین بەم شێوەیەی لای خوارەوە

1- لە پێش فارزە ، هیچ Spase نەبێت لە دوای فارزەش با یەك Spase هەبێت .
2- لە پێش خاڵ . هیچ Spase نەبێت و لە دوای خاڵیش با دوو Spase هەبێت .
3- ئەو بەڕێزانەی کە بابەتی وەرگێڕان ئەنێرن با ئاماژە بە سەرچاوەکەی بکەن

# پێڕست








## بەرنامە 3



## زانیاری 28












## ڕیپۆرتاژ 38



## ئەنتەرنێت 41



## هەمەڕەنگ 57




# بەرنامەی RAM&HDD Cleaner

ئا: دلێر قاسم

زۆر جار ئیمە لەکاتی کارکردنمان لەسەر ئامێری کۆمپیوتەر هێمای CLOSE دێتە سەرشاشە هەندێ جار لاناچێت تا ئەو بەرنامەیەی کە کاری لەسەردەکەی دانەخەی وەهەندێ جاریش هەر لاناچێت تا کۆمپیوتەرەکەمان پێ ریستارت دەکاتەوە ئەمەش دەبێتە گرفت لەبەردەممان . لەم کاتە بەرنامەی (RAM&HDD CLEANER) ئەم گرفتەمان بۆچارەسەر دەکات.

پاش دابەزادنی بەرنامەکە لەسەر ئامێری کۆمپیوتەر دیین بەرنامەکە دەکەینەوە لەلای راست لەخوارەوە FAST CLAENING نوسراوە بەماوس یەکجار کلیکی لەسەردەکەین (وێنە ١) راستەو خۆ رام و هاردمان بۆخاوێن دەکاتەوە بۆماوەی چەند دەقەیەک ئینجا بەرنامەکە دادەخەین لەوکاتەوە خۆی رۆژانە لەگەڵ پێکردنی کۆمپیوتەر وەک ئەنتیڤایرۆس کاردەکات هەرگرفتێک هەبێت خۆی چارەی دەکات بێ ئەوەی ئیمە بیکەینەوە.

# بەرنامەی Scheduled Tasks

وێنەی (١)


وێنەی (٢)

ئا: مەحمود ساڵەیی
mehmud_felek@yahoo.com

بەرنامەیەکە لەگەڵ ویندۆزدا دابەزێت وەکو (مونەببەهێک) کاردەکات، بۆ نموونە دەمانەوێ بەرنامەیەک ڕۆژانە کاربکات لە کاتێکی دیاری کراودا.

بۆ چوونە سەر بەرنامەکە سەیری وێنە(١) بکە.

دوای کردنەوەی بەرنامەکە دوو کلیکی لە سەر دەکەین و دوای ئەوە (التالی) دادەگرین و پاشان چوارچێوەیەکی ترمان بۆ ئەکرێتەوە کەچەند هەڵبژاردنێکی وەک وێنە (٢).

وەک لە وێنەکەدا دیارە تۆ بەرنامەیەک هەڵئەبژێریت و بەردەوام ئەبیت دوای




وێنەی (٣)

ئەمە چوار چیوەیەکی ترت بۆ ئەکریتەوە کە بەرنامەکە بە چ شێوەیەک کاربکات وەک (رۆژانەو هەفتانەو مانگانە) .. تۆ یەکێکیان هەڵئەبژێری کەخۆت پێویستتە وەک وێنە (٣).

بۆ نموونە رۆژانەمان هەڵبژاردو بەردەوام بووین دوای ئەمە داوای ئەوە دەکات چەند رۆژ جارێک کاربکات یاخود کاتژمێر چەند کاربکات وەک وێنە (٤).

دوای بەردەوام بوونت داوای دانانی ووشەی نهێنیت لێ ئەکات توش داینەوە بەردەوام ببە تاکوتایی وەک وێنە (٥).




وێنەی (٤)




وێنەی (٥)

# وێنە گرتن لەبەرنامەی Vcd Cutter

ئا: رزگار محمد

بێگومـان زۆرجـار ئێمـە پێویسـتمان بەوێنەیـەک دەبێـت بۆنمونـە ئەگـەر سیدییەکمان هەبێت ئەو سیدییە فلم بێت یاخود کلیپ بێت چۆن دەتوانین وێنەیەک لەو سـیدییە دەر بێنین بێگومان لەرێگای بەرنامـەی VCD CUTTER وە دەتوانین ئـەوکارە ئەنجـام بدەیـن بەرنامـەی VCD CUTTER دەکەینـەوە ئـەو پارچە ڤیدیۆیەی کـە وێنەکەمان پێویسـتە لێی دەربهێنیـن دێنینـە نـاو بەرنامەی VCD CUTTER لەرێـگای فایـل لەوێوە ئۆپن بەم شـێوەیەی (وێنـە ١) پاشان ڤیدیۆکە دێنینە ئەوشوێنەی کە وێنەکەمان پێویستە ئینجـا لەخوارەوە وێنـەی کامیرایەک بە بچووکـی دیارە هەر کاتێ کلیک لەسـەر ئـەو کامیرایـە بکەین وێنەیـەک دەچێتە نـاو بەرنامـەی VCD CUTTER وەک (وێنە٢).




وێنەی (١)




وێنەی (١)

# به‌رنامه‌ی 3D ME NOW

ئا: ده‌وه‌ن مه‌سعود ساڵه‌یی
dawan1985@yahoo.com

یه‌کێکه له به‌هێزترین به‌رنامه‌کانی ده‌ستکاری کردنی وێنه و دانانی له لاپه‌ڕه‌کانی وێب سایته‌که‌تدا، وه‌هه‌روه‌ها دۆبلاژ کردنی وێنه واته ئه‌گه‌ر گۆرانییه‌کمان هه‌بێ وه بمانه‌وێ وێنه‌ی خۆمانی له سه‌ر دابنێین واته له‌گه‌ڵ ده‌می ئێمه‌دا بجووڵێته‌وه ئه‌وا ئه‌م به‌رنامه‌یه زۆر ئاسانکاریمان بۆ ئه‌کات.
به‌ڕێزان له گه‌ڵمان بن بۆ شاره‌زابوونی ئه‌م به‌رنامه‌یه پشت به خودا..........
دوای کردنه‌وه‌ی به‌رنامه‌که دوو هه ڵبژاردنمان ده‌داتێ که وێنه‌ی ڕووه‌و ڕوو وه وێنه‌ی لاته‌نیشت وه‌ک (وێنه ژماره ١).
دوای هه‌ڵبژاردنی وێنه‌کان لاپه‌ڕه‌ی سه‌ره‌کی به‌رنامه‌که‌مان بۆ ده‌بێته‌وه وه‌ک (وێنه ژماره ٢).
ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ بۆ نموونه قژی بگۆڕین ده‌چینه سه‌ر به‌شی (HAIR STYLES) له‌وێدا ده‌ستکاری ده‌که‌ین یاخود قژێکی به ئاره‌زووی خۆمانی بۆ داده‌نێین وه‌ک (وێنه ژماره ٣).




وێنه‌ی (١)

وه‌ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ ڕیشی بۆ دابنێین هه‌ر له هه‌مان به‌شی پێشوو دا داده‌نرێ وه ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ چاویلکه‌ی بۆ دابنێین ئه‌وا ده‌چینه سه‌ر به‌شی (SPECTACLES) له‌وێدا گۆرانکاری به‌سه‌ردا دێنین.
وه ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ ڕووبه‌ری کاره‌که‌مان زیاد بکه‌ین ئه‌وا کلیکێک له‌سه‌ر (POINTS+ OR -) ده‌که‌ین و بۆ زیاتر کردنی خاڵه‌کانی وه ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ ئاڕاسته‌ی ڕووه‌که بگۆڕین ده‌چینه سه‌ر به‌شی (ANIMATE) وه‌ک گۆڕینی ئاڕاسته‌ی سه‌رو تروکاندنی چاو و... هتد وه‌ک (وێنه ژماره ٤).
وه ئه‌گه‌ر ویستمان ده‌نگێکی له گه‌ڵ دابنێین ئه‌وا له‌به‌شی خواره‌وه‌ی به‌رنامه‌که‌دا ده‌نگێکی بۆ ئه‌هێنین یان له سه‌ره‌وه‌ی به‌رنامه‌که‌دا به مایک ده‌نگێک دروست بکه‌و له کۆتاییدا برۆ سه‌ر به‌شی (PREVIEW) ئه‌نجامی کاره‌که ده‌بینین وه‌ک (وێنه ژماره ٥).
وه‌له کۆتاییدا (SAVE) ی کاره‌که ئه‌که‌ین و به (TYPE) ی (HTML) خه‌زن ئه‌بێ.




وێنه‌ی (٢)

## بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ

# چۆن دەتوانین رەنگی پارچە ڤیدیۆیێک بگۆڕین بۆ شێوەی کۆن




وێنەی (١)

ئا : فاخیر محمود میرزا

واتا ئێمە کار لەسەر گۆرانیەک دەکەین دەمانەوێ شێوەی رەنگی گۆرانییەکە رەش و سپی بێت یاخود وەک فلیمە کۆنەکان بارانی لێ دروست بێت زۆرجار ئێمە گۆرانی لەم شێوەمان کەوتۆتە بەرچاو کاتێک سەیری گۆرانییەکە دەکەین تەصویرەکەی زۆر کۆن دیارە بەلام گۆرانی یەکە نوێیەو کۆنیش نیە ئەم کردارە لەبەرنامەی میدیا ستۆدیۆ زۆربەئاسانی ئەنجام دەدرێت سەرەتا دێین بەرنامەکە دەکەینەوە ئینجا ئەو پارچە ڤیدیۆیەی کە پێویستمانە دێنینە ناوبەرنامەکە پاشان بەلای راست کلیک لەسەر گۆرانیەکە دەکەین لیستێک دەبێتەوە ئینجا لەم لیستە لەناوەراستدا VIDEO FILTER لێدەدەین بەماوس بەم شێوەیە (وێنە١) پاشان لیستێکی تر زیاد دەبێت کەچەند شتێکی تێدا نوسراوە کەهەر یەکەو کارێک ئەنجام دەدەن

# بەرنامەی Ulead DVD PictureShow SE




وێنەی (١)

ئا: ژوان خضر

ئەوبەرنامەیە سـوودی لێوەردەگیرێت بۆ ریزکردنی وێنەو هەروەها نیشاندانی بەشـێوەی کلیـپ کەدەتوانیـت دەنگیش لەگەڵ وێنەکان دابنێیت بێگومان ئەوکارە زۆر پێویسـتە زۆرجـار ئێمـە کۆمەڵـە وێنەکمـان هەیە دەمانـەوێ لێکیان دەین بەشـێوەی فلیمی و هەروەها گۆرانیشی لەگـەڵ بێت . سـەرەتا دێیـن بەرنامەکە دەکەینەوە لەسـەرەوە دوو هەڵبژێردراو هەیـە یەکەمیـان VCD 2.0 و ئەویتریـان DVDیـە واتا دەتوانی راسـتەو خۆ پاش تەواوبوونـی کارەکانـت کۆپـی بکەیـت بەشـێوەی VCD و هەروەها بەشـێوەی DVD ئێستا دێین یەکەمیان هەڵدەبژێرین ئەویـش بریتییـە لـە VCD ئینجـا NEXT دەکەین لیستێکی تر دێتە بەرچاو (بڕوانە وێنـە ١) ئینجا لەسـەرەوەی ئەم لیسـتە ADD SLIDESHOW هەیـە یـەک جـار بەماوس کلیکی لەسـەردەکەین لیستێکی تردەبێتەوە ئەویش لیسـتی بەرنامەکەیە هاردەکان شـیدەکاتەوە پێـت دەڵێت کام وێنەت دەوێ دەست نیشانی بکە هەروەها




وێنەی (٢)

لـەلای چەپ لەخـوارەوە دوو نوسـراو هەیە زۆر گرنگن یەکەمیان SLIDESHOW TITLE ە و ئەویتریـان BACKGROUND MUSIC ە یەکەمیان سودی لێوەردەگیرێت بۆ نووسـین واتا هەر نووسینێک بکەیت لەسەر وێنەکان دیار دەبێت ئەمەش زۆر پێویستە ئەویتریان سودی لێوەردەگیرێت بۆ دانانی گۆرانی یاخود مۆسـیقا لەگەڵ وێنەکان گوێبیسـت دەبین پاشان بەهۆی مـاوس ئەو وێنانەی پێویسـتمانە دیاری دەکەیـن پاشـان ADD IMAGE لێدەدەین دەبینیـن ئـەو وێنانـەی دیاریمانکـردوە دێتـە نـاو بەرنامەکـە (وێنـە ٢) ئینجـا لەخوارەوە DONE هەیە بەماوس کلیکێک لەسەری دەکەین پاشان NEXT لێدەدەین لیسـتێک دەکەوێتـە بەرچـاو (بڕوانـە وێنـە٣) لەسـەرەوە لەرێگای PROJECT TEMPLATE دەتوانیـت باکگراونـدی وێنەکان بگۆڕێت پاشـان دووبارە NEXT لێدەدەین دیسان لیستێکی تردێت دیسان NEXT لێدەدەین ئینجا لیستی کۆتایی دێت بەمەرجێک دەبێت ئامێری کۆمپوتەرەکەت رایتەری لەسـەربێت ئینجا سـیدی بەتاڵ دەخەینە سـەر رایتەر و دووبارە NEXT دەکەین سەیردەکەین ئەوکارەی کردمان دەچێتە سەر سیدییەکە.



وێنەی (٣)

# زنجیرەی (٢) لەبەرنامەی AUTOCAD

ئامادەکردنی: غزالە یونس

## فەرمانەکانی ووردی لە وێنەکردندا (الدقة في الرسم)

بە شێوەیەکی سەرەکی ئەم فرمانانە سودیان زۆرە لەکاتی وێنەکردندا.چونکە ووردن لە کاتی وێنەکردندا وە هەروەها خێرایی کارکردن و وێنە کردنمان زیاد دەکات، ئەمانیش دەکەوێتە شریتی چۆنی (الحاله) کەدەکەوێتە خوارەوەی رووبەری بەرنامەکە .ئەمانیش بریتین لە:-

١-GRID:- ئەمانیش چەند خاڵێکن سنوری دیاری کراویان هەیە، خاڵەکانیش وەک یەکن لەدووریدا بەسێ ریگا دەتوانین بەکاری بخەین و دەست نیشانی بکەین:

ا-کلیک کردن لە سەر شریتی چۆنی (الحاله) لە سەر ئایکۆنی GRID.

ب- داگرتنیF7 لە سەر کیبۆرد.

ج-دەچینە سەر لیستی TOOLS و دەست نیشان کردنی DRAFTING SETTING (وێنەی١) چوار گۆشەیەک دێت ئینجا کلیک کردن لەسەر GRID،(وێنەی٢)

٢-SNAP:-ئەمیش واتە رۆیشتنی تیری ماوسە لەسەر خاڵەکانی GRID بە شێوەی بازدان. بەسێ ریگا دەست نیشان دەکرێ:-

ا-کلیک کردن لە سەر شریتی چۆنی (الحاله) لەسەر ئایکۆنی SNAP

ب-داگرتنیF9 لە سەر کیبۆرد.

ج-دەچینە سەر لیستی TOOLS و دەست نیشان کردنی DRAFTING SETTING (وێنەی١) پەنجەرەیەک دەبێتەوە ئینجا کلیک کردن لەسەر SNAP، (وێنە ی٣)

وە بۆ دەست کاری کردنی دووری ونزیکی خاڵەکان دەچینە سەر لیستی TOOLS ئینجا دەست نیشان کردنی DRAFTING SETTING پەنجەرەیەک دێت کە دەتوانرێ دەستکاری بکەین و ژمارەکان بگۆرین بۆنموونە دووری خاڵەکان لە یەکتری دەکەینە (١٥) کەخۆی لە سەرەتادا (٥) وەک لە وێنەی (وێنەی٤) دیارە.

٣-ORTHO:-سودی ئەم فرمانەش ئەوەیە دروست کردنی هێڵی راستی ئاسۆیی وستونی، بەسێ رێگا دە ست نیشان دەکرێ:-



وێنەی (١)



وێنەی (٢)



وێنەی (٣)

١- کلیک کردن لە سەر شریتی چۆنی (الحالة) لەسەر ئایکۆنی ORTHO

ب-داگرتنی F8 لەسەر کیبۆرد.

ج-نوسینی ووشەی ORTHO لە شریتی زانیارییەکان COMMND

٤-ODJECT SNAP: O SNAP:-

سودەکانی ئەم فرمانە زۆرن، چونکە لە کاتی وێنەکردندا سەرەتاو کۆتایی ناوەراستی راستەهێڵمان بۆ دەردەخات هەروەها خاڵی یەکتربرین و خاڵی ستون و خاڵی چەقی بازنەو خاڵەکانی هەر چوارلای شێوە هێلکەیی و چەند خاڵی تریش، بەچەند رێگایەک دەست نیشان دەکرێ.

ا-کلیکی دە ستە چەپ لە سەر شریتی چۆنی (الحالة) لەسەر ئایکۆنی(ODJECT SNAP) دەست نیشان کردنی SETTING هاتنی پەنجەرەی ODJECT SNAP (وێنەی٥).

ب-داگرتنی F3 لە سەر کیبۆرد.

ج-دەچینە سەر لیستی TOOLS و دەست نیشان کردنی DRAFTING SETTING (وێنەی١) پەنجەرەیەک دەبێتەوە ئینجا کلیک کردن لەسەرODJECT SNAP، (وێنەی٦)

(پاش هاتنی پەنجەرەی ODJECT SNAP سەرەتا لەناو پەنجەرەکە چوار گۆشەیەکی بچوک هەیە لەرێزی سەرەوە بەئیشی دەخە ین ئەویش بەکلیک کردن لەسەری، ئینجا چیمان بوێت لە فرمانەکان دەست نیشانی دەکەین).

## دەست نیشان کردنی رژێمیی (مەتری یان ئینج)

پێش دەست پێکردنت بەهەر کارێکت سەرەتا دەبێ بزانیت دووری وێنەکەت بە مەترە یان ئینجە لێرەدا لەو بەرنامەیە بەهەمان شێوە دەتوانین دەست نیشانی چۆنییەتی کارەکەت بکەی ئایە دووریەکەی بە مەترە یان بە ئینجە، بۆ دەست نیشان کردنی رژێمی مەترو یان ئینج لە بەرنامەی AUTO CAD دەچینە سەر لیستی FILE پاشان دەست نیشان کردنیNEW (وێنە ی٧) ئینجا پەنجەرەیەک دێت.

ئینجا لە خوارەوەی پەنجەرەکە تیری ماوس دەبەینە سەر سێگۆشەیەکی بچوک بە کلیک کردن لەسەری دەتوانین رژێمی مەتری دەست نیشان بکەین (وێنەی ٨)

## دە ست نیشان کردنی رەنگی تابلۆی کارەکەت

سەرەتا بۆ گۆرینی رەنگی تابلۆکەت کە بەپێی ئارەزوو ویستی خۆت دەتوانیت



وێنەی (٤)



وێنەی (٥)



وێنەی (٦)



وێنەی (٧)



وێنەی (٨)



وێنەی (٩)



وێنەی (١٠)



وێنەی (١١)

دەست نیشانی بکەیت ئەویش پێش دەست پێکردنت بەکاری خۆت یان دوای کۆتایی هاتنت لە کارەکەت، خۆی ڕووبەری بەرنامە سەرەتا ڕەنگی ڕەشە بەلام ئێمە زۆر جار حەز دەکەین لە ڕەنگی جوان و سەرنج ڕاکێش یان بەپێی کارەکەمان ڕەنگ دەست نیشان دەکەین، لێرەدا بۆ گۆڕینی ڕەنگەکەی دەچینە سەر لیستی TOOLS دەست نیشان کردنی OPTIONS (وێنەی٩) پاشان پەنجەرەیەک دێت دەچینە سەر فرمانی DISPLAY پاشان دەچینە سەر فرمانی COLORS بەکلیک کردن لەسەری پەنجەرەیەکی تر دێت. ئینجا لەناو پەنجەرەی دووەم دەچینە سەر فرمانی COLOR لیستێکی دیاری کراو لەڕەنگ دێت. بۆ نمونە کلیک لەسەر ڕەنگی سور دەکەین (وێنەی١٠) ئینجا کلیک لەسەر (CLOSE&APPLY) دەکەین، پەنجەرەکان دا دەخەین دەبینین ڕووبەری کۆمپیوتەرەکە بەڕەنگی سور داپۆشراوە (وێنەی ١١).

# زنجیرەی (٤) لە بەرنامەی فلاش MX

# جوولە لەفلاشدا Motion Tween

فەیسەڵ مەعروف




وێنەی (١)

جوولە لە فلاشـدا بریتی یە لە جولاندن و گواستنەوەی وێنە و شـێوەکان لە شـوێنێکەوە بۆ شـوێنێکی تر، یا لەبارێکەوە بۆ بارێکـی تر (گەورە کردن و بچووک کـردن)، یا لە رەنگێکەوە بـۆ رەنگێکـی تر، دروسـتکردنی جوولەش بە چەنـد قوناغێک تـی دەپـەڕێ تا دەگاتە بـاری ئامانج لـە ڕێگایـەوە دەتوانین وێنەکان ڕەنگیان بگۆڕین. بۆ دروستکردنی جوولە لایەنی کەم پێویستیمان بە دوو فەرمان هەیە یەکەم شێوەیەک ودووەمیش ڕێ ڕەوی جوولـە یا قۆناغەکانی جوولە، وەک گواسـتنەوەی شـێوەکان لـە لایەکەوە بـۆ لایەکی تر ئەمەش بـەر بڵاوترین جۆری جولەیە . چۆنیەتی دروستکردنی جوولە:

١- لە چوار چێوەی ژمارە (١) وێنەی بازنەیەک دەکێشین و بە ڕەنگی ڕەش ڕەنگی دەکەین.

٢- دەچینە سـەر چوار چێوەی ژمارە (٤٠)و هەڵدەستین بە زیـاد کردنی چوار چێـوەی کلیـلKEY FRAME، دەبینین کەوا بازنەکـە لـە باری خـۆی دەمێنێتەوە لەگەڵ ڕەنگـی بنچینەیی خۆی، وە لە سەر چوار چێوەی ژمارە (٤٠) بازنەکە دەجولێنین بـۆ هـەر لایەک لە لایەکانی شـانۆی کار کردن وە ڕەنگیشـی بە ئارەزووی خۆمان دەگۆڕین با ڕەنگی(سـەوز) بێ . وێنەی ژمارە(١،٢).

٣- کلیکـی ڕاسـتە لـە سـەر چـوار چێـوەکان دەکەیـن بۆ ناساندنیان. وێنەی (٣) پاشان لە سەر چوار چێوە ناسراوەکان کلیـک دەکەیـن و فەرمانـی CREATE MOTION TWEEN هەڵدەبژێرین. وێنەی(٤).

٤- دەبینین شـریتەکان ڕەنگی شـین دەبێت وە لە ناو ڕەنگە شـینەکەش تیشـکێکی ڕەش هەیە، ئەوەش جـۆری جوولەکە دەگەیەنێ . وێنەی (٥).

٥- هـەردوو دوگمـەی (CTRL+ENTER) لـە سـەر کیبـۆرد دادەگرین بۆ بینینی ئەنجامی کارەکەمان، دەبینین کەوا بازنەکە دەسـت دەکا بە جوولە لەو شـوێنەی خۆی بـەڵام ڕەنگەکەی وەک خۆی دەمێنێتەوە، بۆ زانینی هۆیەکەی پێویستە شارەزای تایبەتمەندی فلیم بین:

تایبەتمەندییەکانی MOVIE CLIP:

هێمایەکانی لە فلاشدا (٣) جۆرن:

١- فلیم



وێنەی (٢)

٢- دوگمە BUTTON

٣- وێنە GRAPHICS

وە هەریەک لەم هێمایانە تایبەتمەندی دیاری کراوی خۆی هەیە، لێرە دا باسی فلیم دەکەین:

١- بۆ ئاخنینی ئەم هێمایە وێنەی بازنەیەک لە چوار چێوەی ژمارە (١٢) دەکێشین، و پاشان کلیکی لە سەر دەکەین بۆ



وێنەی (٣)

ناساندنی و پاشان دوگمەی F8 دادەگرین ئەم دوگمەیە هەڵدەستێ بە گۆڕینی بازنەکە بۆ MOVIE CLIP . وێنەی (٦).

٢- دەچینە سەر چوار چێوەی ژمارە (٤٠) و هەڵدەستین بە ئاخنینی KEY FRAME دەبینین هیچ گۆڕانکاریەک بە سەر شێوە و رەنگی بازنەکە دا نەهاتووە.

٣- فەرمانی SCALE کلیک دەکەین بۆ گۆرینی قەبارەی بازنەکە و گواستنەوەی بۆ ئەو شوێنەی دەمانەوێ. وێنەی (٧).

٤- لە شاشەی تایبەتمەندیەکان COLOR هەڵدەبژێرین و لەم دوگمەیەی لە تەک COLORهەیە دەبینین بی رەنگە. وێنەی(٨)، ئێمەADVANCED هەڵدەبژێرین و بری رەنگەکان دیاری دەکەین هەروەک لە وێنەی (٩،١٠) دا دیارە .

٥-OKدەکەین و کلیکی راستەدەکەین بۆ ناساندنی چینەکە و فەرمانی CREATE MOTION TWEENهەر وەک لەسەرەتا باسمان کرد.

٦- هەردوو دوگمەی (CTRL+ENTER) لە سەر کیبۆرد دادەگرین بۆ بینینی ئەنجامی کارەکەمان، ئەنجامەکەش بریتی یە لە(٣) جوولە (گواستنەوە، بچووکردنەوە،جوولەی رەنگ)، ئەمەش تایبەتمەندی فلیمە.



وێنەی (٤)




وێنەی (٥)




وێنەی (٦)

## جووڵــە بە هۆی چــوار چێوە FRAME BY FRAME ANIMATION:

ئەم جۆرە جووڵەیە بە شـێوەیەکی سەرەکی پشت دەبەستێ بــە چوار چێــوەی کلیــل یــا خاڵــی گۆڕیــنKEY FRAME. بۆ دروستکرنی ئەم جۆرە جووڵەیە :

١- سەرەتا دەبێ بیر لەوە بکەینەوە کەوا شێوەیەک دروست بکەیــن و دواتــر گۆڕانــکاری بەســەر قەبارەکــەی بهێنین وە هەروەهــا درێژی جووڵەکەش دیاری بکەین بۆنمونە (٥) چوار چێوە بێت .

٢- دەســت دەکەیــن بــە وێنەکێشــانی بازنەکە لە شــریتی ئامرازەکان. وێنەی (١١) .

٣- دەبینین خاڵی گۆڕین یا جووڵە دامەزرا لەگەڵ وێنەکێشانی بازنەکە، ئێســتا کلیکی ڕاستە لە سەر چوار چێوەی ژمارە (٢) دەکەیــن و فەرمانی INSET KEY FRAMEهەڵدەبژێرین، بازنەکە لە ســەر چوار چێوەی ژمارە (٢) دروست بوو ئێستا فەرمانی




وێنەی (٧)




وێنەی (٨)




وێنەی (٩)




وێنەی (١٠)




وێنەی (١١)




وێنەی (١٢)




وێنەی (١٣)

SCALEهەڵدەبژێرین بۆ بچوکردنەوەی قەبارەی بازنەکە . وێنەی (١٢).

٤- لە سەر چوار چێوەی ژمارە (٣) ئامرازی SUBSELECTION TOOLبە کار دەهێنین بۆ گۆڕانکاری بە سەر شێوەی بازنەکە، و لە چوار چێوەی ژمارە (٤) گۆڕانکاریەکی تر دەکەین، وە لە چوار چێوەی ژمارە (٥) بە هەمان شێوە.

٥- هەردوو دوگمەی (CTRL+ENTER) لە سەر کیبۆرد دادەگرین بۆ بینینی ئەنجامی کارەکەمان. وێنەی (١٣).




وینەی (١)

# بەرنامەی mix-fx

ئا: پۆلا فەرهاد
Blue_p4@yahoo.com

ئەم بەرنامەیە دەتوانی شیوەی فلاشی جوان دروست بکات بە چەند فۆرماتیک دەتوانی خەزنی بکات بە شیوەی فۆرماتی مایکرۆ میدیا و وە دەتوانی بە فۆرماتی HTML خەزنی بکات بۆ ئەو کەسانە زۆر باشە کە لاپەرەی ئنتەرنێت دروست دەکەن چونکە بەرنامەی فرۆنت پەیج زۆر بە ئاسانی دە توانی وەری بگریت وە هەروەها بۆ ئەو کەسانەش باشە کو کاری ئۆتۆ رەن دەکەن وە بە فۆرماتی PROJECTOR خەزنی بکات بۆ جوانی.

دوای دا بەزاندنی بەرنامەکە لە سیدی گۆڤارەکە دەچین بەرنامەکە دەکەینەوە سەیری وینەی ١ بکە START پاشان ALL PROGRAMS پاشان دەچینە سەر بەرنامەی MIX-FX بەرنامەکەمان بۆ دەکریتەوە.

پیناسەکردنی هەموو ئایکونەکان و فرمانەکانی نوسینەکە (وینەی ٢).

١- ئەو نوسینەی کە دەمانەوێ بەشیوەی فلاشی بجولی لە خانەیە دەینوسین.

٢- جولەی نوسینەکە واتە ئێمە دەتوانین ئیفێکتیک بدەین بە نوسینەکەمان بجولێت.

٣- شیوەی نوسینەکە واتە لیرەوە فۆنتیک هەلدە بژیرین بۆ نوسینەکەمان.

٤- تاقیکردنەوەو جیبە جیکردنی ئەو کارانەی کردیتمان.

٥- قە بارەی نوسینەکە.



وێنەی (٢)



وێنەی (٣)



وێنەی (٤)

٦- سەراو گێرکردنی نوسینەکە.

٧- رەنگی نوسینەکە.

٨- رەنگی باکگراوند.

٩- قەبارەی لاپەڕەکە لێرە دیار دەکەین.

١٠- پاش ئەوەی کە قەبارەی پەڕەکەمان دیار کرد کلیک لە سەر ئەم فەرمانە دەکەین بۆ جێبەجێکردن.

١١- هێنانی نوسین بۆ لای چەپ و ڕاست.

١٢- هێنانی نوسین بۆ سەرەوە و خوارەوە.

پێناسە کردنی ئایکۆن و فەرمانەکانی باکگراوند (وێنەی ٣).

١- ئەگەر کلیک لە سەر ئەم فەرمانە بکەین بەشەکانی ڕێکخستنی باکگراوندمان دێتە پێش.

٢- قەبارەی ئەو شێوە فلاشیەی بۆ باکگراوندمان هەڵبژاردوە دیاری دەکەین.

٣- سەراو گێرکردنی باکگراوندی شێوەی فلاشی.

٤- ڕەنگی باکگراوندی شێوەی فلاشی.

٥- هەڵبژاردنی شێوە فلاشیەکان بۆ باکگراوەند.

٦- هێنانی شێوە فلاشێکە بۆ لای دەستی چەپ و ڕاست.

٨- هێنانی شێوە فلاشێکە بۆ سەرەوەو خوارەوە.

پاش ئەوەی فلاشێکی جوانمان دروست کرد ئیستا سەیڤی دەکەین.

کلیک بکە لە سەر SAVE پاشان شێوەییکی ترت بۆ دەکرێتەوە جۆری فۆرماتەکانە کە پێی سیڤ بکەین CREATE PROJECTOR هەڵدە بژێرین پاشان OK دەکەین پاشان شێوەییکی ترمان بۆ دەکرێتەوە لە شوێنێک سەیڤی دەکەین سەیری (وێنەی ٤) بکە شێوەی کۆتایی.

# زنجیرە (٤) لە بەرنامەی Adobe Premier

فەیسەڵ مەعروف




وێنەی (١)

## ڕێکخستنی پارچەی دیمەنەکان

پاش ئەوەی لە ژمارەی پێشوو باسی بڕینی پارچەی دیمەنەکانمان کرد، ئێستاباس لە ڕێکخستنی ئەو پارچە براوانە دەکەین وهەروەها گونجاندی لەگەڵ ئەو بابەتە دەنگیەی لەگەڵ دیمەنەکان هەن، چەند ڕێگایەک هەن:
یەکەم: ڕاکێشانی پارچەی یەکەم لە دیمەنی دووەم تا بە تەواوی لەگەڵ خاڵی گەڕانەوە دەگونجێ، ئەم ڕێگایە لەگەڵ ئەم نمونەیە دەگونجێ چونکە بەشێ لە بابەتی یەکەممان بڕیوە، چەند چرکەیەک لە بابەتی یەکەم کەبڕاوە دەگێڕینەوە، بۆ ئەوەی کاتەکەی کەمێ درێژبێتەوە و بگونجێ لەگەڵ سەرەتایی دیمەنی دووەم و بابەتە دەنگیەکە .بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش ئەم هەنگاوانە دەگرینە بەر:

١- شێوازی نمایشکردن لە پەنجەرەی بینین دەگۆڕین، ئەو ڕێگایە هەڵدەبژێرین کەوا لەمیانەیدا بتوانین پارچەی کۆتایی لە دیمەنی یەکەم و پارچەی یەکەم لە دیمەنی دووەم ببینین، خاڵی دەستکاریش ئەو خاڵە دەبێت کەوا هەوڵدەدەین ڕێکخی بخەین لەگەڵ خاڵی گەڕانەوەی بابەتە دەنگیە کە.بۆ گۆڕینی شێوازەکەش لە پەنجەرەی MONITOR ئایکۆنی TRIM MOEDکلیک دەکەین . وێنەی (١)٠

٢- شێوازی نمایشکردن دەگۆڕێ بۆ شێوازی نمایشکردنی خاڵی یەک گەیشتنی نێوان دیمەنەکان، ئەم ڕێگایەش زۆر چاکە بۆ بینینی ئەو دیمەنانەی بڕدراون یان زیاد کراون٠

٣- بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆمان بچینە سەر پارچەکان فەرمانی PREVIOUS EDIT ژمارە (١) بەکار دەهێنین بۆ بینینی خاڵەکانی بەیەک گەیشتنی پێشوو، وە فەرمانی NEXT EDIT ژمارە (٢) بۆ بینینی پارچەی دواتر، وە بۆبینینی بەشێ لە هەردوو بابەتەکە و لەگەڵ دیار خستنی خاڵی بە یەک گەیشتنی نێوانیان فەرمانی PLAT EDIT ژمارە(٣) بە کار دەهێنین، وە لە کاتی جێبەجێکردنی ئەم فەرمانانە چاودێری هەڵبەزەی هێلی دەستکاری دەکەین لە پەرنجەرەی دەستکاریTIME LINE وێنەی (٢)٠

٤- دەگەڕێنەوە بۆ خاڵی بە یەک گەیشتنی نێوان دیمەنی یەکەم و دیمەنی دووەم، کێرسەری ماوسەکە لە یەکێ لە پەنجەرەکان دەجوڵێنین و چاودێری گۆڕانی نیشانەی ماوسەکە دەکەین کە دەگۆڕێ بۆ نیشانەی بڕینROLLING کلیکی ڕاستە دەکەین و ڕایدەکێشین، ڕاکێشیان بەرەو هەر لایەک ئەوا کاتی ئەو لایەی بۆ لای ئەو ڕادەکێشی کەم دەبێتەوە و بە پێچەوانەوە کاتی بابەتەکەی تر زیاد دەکات .وێنەی (٣)٠




وێنەی (٢)




وێنەی (٣)




وێنەی (٤)




وێنەی (٥)




وێنەی (٦)




وێنەی (٧)

٥- لەکاتی راکێشانی سەیری هێڵی دەستکاری دەکەین دەبینین لەگەڵ گەڕانەوەی بابەتە دەنگیەکە کەوتوونەتە سەر یەک . وێنەی(٤)٠

٦- دوگمەی PLAY کلیک دەکەین دەبینین چۆن سەرەتای دیمەنی دووەم لەگەڵ خاڵی گۆڕان لە ئاستی بابەتە دەنگیەکە چارەسەر کراوە، وە سەیر دەکەین کاتی دیمەنەکەش کورت بۆتەوە، کرداری راکێشانەکە لە سەر حیسابی هەمان ئەم بابەتە بووە، هەروەها خاڵی دەستکاری دواتر لە شوێنی خۆیان ماونەتەوە بە بێ گۆڕان.

بۆ پەشیمان بوونەوە لەم کردارە (CTR+Z) دادەگرین لە کیبۆرد وە یاخود ئامرازی هاریکاری HISTORY بە کار دەهێنین لە میانەی دا دەتوانین لەم کردارانەی کە پێشوو ئەنجامامان داوە پەشیمان بینەوە، ئەگەر پەنجەرەی HISTORY لە سەر شاشەی بەرنامەکە نەبوو ئەوا دەچینە سەر فەرمانی WINDOWS و پاشان SHOW HISTORY هەڵدەبژێرین. وێنەی (٥).

لە پەنجەرەی HISTORY لەم کردارانە دەگەڕێین ئەنجامامان داوە، ئەویش (ROLLING EDIT)ە و دیاری دەکەین. وە DELETE دادەگرین بۆ سڕینەوەی . وێنەی (٦). پاشان پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە و فەرمانی YES هەڵدەبژێرین. وێنەی (٧) .

دووەم: بۆ رێکخستنی پارچەی یەکەم لە دیمەنی دووەم.CYCLERS AVI لەگەڵ نیشانەی گەڕانەوە لە بابەتی دەنگیەکە. هەڵدەستین بەگواستنەوەی خاڵی دەستکاری و بەیەک گەیشتنی نێوان هەردوو بابەتی یەکەم و دووەم بۆ ئەوەی ئەم خاڵە لەگەڵ ڕێ ڕەوی دەنگەکە لە یەک ئاستدا بن. ئەم کردارە پشت دەبەستێ بە کەمی درێژکردنەوەی کاتی دیمەنی یەکەم بێ ئەوەی کاریگەری هەبێت لە سەر کاتی بابەتی دوایی دیمەنەکە بەڵکو تەنها لای دەبات. بۆ

وێنەی (٩)

وێنەی (٨)

ئەنجامدانیشی ئەم هەنگاوانە دەگرینە بەر:

١- هێڵی دەستکاری EDIT LINE دەجولێنین تا نیشانەکە لە خاڵی دەستکاری و بە یەک گەیشتنی نێوان هەردوو دیمەنی یەکەم و دووەم رادەوستێ. وێنەی (٨).

٢- لە TIME LINE فەرمانیROLLING EDIT TOOL هەڵدەبژێرین وە یا (P) لە کیبۆرد دادەگرین. وێنەی (٩).

٣- هەڵبژاردەی راکێشان بەرەو لێوار TOGGLE SNAP TO EDGES ئەکتیڤ دەکەین ژمارە (١)، کێرسەری ماوسEDIT LINE لە نێوان هەردوو بابەتی یەکەم و دووەم دەجولێنین، کاتێ شێوەی کێرسەر دەگۆڕێ ئەوا کلیکی دەکەین خاڵی بە یەک گەیشتن رادەکێشین تا لەگەڵ نیشانەی گەڕانەوەی بابەتە دەنگیەکە رێک دەکەوێ. وێنەی (١٠)

٤- ئێستا دەرئەنجامی کارەکە دەبینین بەم شێوەیەی لێ دێت کە لە وێنەی (١١) دا دیارە .

سێیەم: لە رێگای شەپۆلی دەنگی هەوڵدەدەین کارەکە ئەنجام بدەین:

١-سەرەتا هەڵدەستین بە فراوانی کردنی چینی دەنگ AUDIO L ئەویش بە کلیک کردنی دوگمەی فراوان کردن و پێچانەوەی چینCOLLAPSE /EXPAND TRACK کە بە بازنەی سوور دەورە دراوە لە وێنەی (١٢).

٢- پاش فراوان کردنی چینەکە بە

وێنەی (١٠)

ئاسانی دەتوانین شەپۆلی دەنگەکە ببینین، وە دەتوانین جیاوازیەکان لە ئیقاعی دەنگەکە جیا بکەینەوە بە هۆی ئامرازی

وێنەی (١٢)

وێنەی (١١)

ROLLING EDIT دەتوانیــن رای بکێشــین تا دەگاتە شــێوەی نووکە دەرچووەکە لە شەپۆلی دەنگەکە. وێنەی (١٣).

٣- بۆبینینی ئەنجامی کارەکە دوگمەی PLAY دادەگرین لە پەنجەرەی PROGRAM وێنەی (١٤).

٤- ئێســتا خاڵی گەرانەوەی کە پێشتر دەســت نیشــانمان کردبوو دەسڕینەوە، لە شــریتی دەنگ لە چینــی دەنگ کلیکی راستە لە سەر لیستی شاراوەکە دەکەین وفەرمانــیCLEAR CLIP MARKER هەڵدەبژێریــن بــۆ ســڕینەوەی. وێنــەی (١٥).




وێنەی (١٣)




وێنەی (١٥)




وێنەی (١٤)

# ئاگاداری

بۆ هەموو ئەو بەرێزانەی کە توانای نووسینیان هەیە لە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت ئەگەر توانای نووسینی بابەتیان هەیە لەم بوارەدا دەتوانن بەشــداری بکەن لە گۆڤاری کۆمپیوتەر و دەتوانن ســەردانمان بکەن یان بابەتەکانیان بنێرن بۆ ئەم ناونیشــانە : هەرێمی کوردســتانی عێراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری جادەی شەست مەتری نزیک هۆڵی زەرد یان پەیوەندی بکەن بە سەرنووسەرەوە بەم ناونیشانە مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس هەولێر بەرامبەر قەڵا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم یان بە ژمارە تەلەفۆنی 2232721 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی

EMAIL : COMPUTER_MAGAZINE_2005@YAHOO.COM
EMAIL : ARAS_CO_CENTER@YAHOO.COM

تێبینی :

*هەر بابەتێک بلاو بکرێتەوە پاداشتی پێ دەدرێت .

* هەر بابەتێک لە شوێنێک یان گۆڤارێکی تری کوردی بلاوکرابێتەوە ئێمە بلاوی ناکەینەوە.

* بابەتەکانتان ئەگەر نەشیا بۆ بلاوکردنەوە ئەوا ناگەرێتەوە.

*هەر کەســێک بابەت ئەنێری بۆ بلاو کردنەوە با بابەتەکەی لەســەر فلۆپی دیســک یان فلاش میموری بێت و وێنەی روونکەرەوەکان بەجیا لە نێو فولدەرێک دا بێت و بابەتەکەی بە بەرنامەی MICROSOFT WORD بنووسێت.




# چۆنیەتی زیادکرن و کەمکردنی دەنگ لەبەرنامەی (Cool Edit Pro)

وێنەی (١)

## ئا: کاوە سلیمان

کول ئیدت پرۆ ئەگەر بێت و ئێمە ئیستا دەنگێک یاخود گۆرانییەکمان هەبێت ئەو دەنگە یان ئەوگۆرانییە دەنگێکی زۆر بەرزی هەبێت لەخۆی زیاتربێت واتا کاتێک گوێبستی ئەو دەنگە دەبی لێی تێناگەی لەبەرئەوەی دەنگی زۆر لەخۆی زیاترە یان ئەگەر دەنگێک یاخود گۆرانییەکمان هەبێت ئەو گۆرانییە دەنگێکی زۆر کزی هەبێت واتا کاتێک ئەودەنگە یاخود ئەو گۆرانییە گوێبیست دەبین بەتەواوی گوێمان لێنابێت لەبەر کزی دەنگەکەی خۆی ئالەم کاتە بەرنامەی کول ئیدت پرۆ یاریدەدەرمان دەبێت و گرفتەکەمان بۆ جێبەجێ دەکات، چۆن سەرەتا ئەودەنگەی پێویستمانە دێنینە ناو بەرنامەکە ئینجا گۆرانیەکە بەماوس دیار دەکەین بەم شێوەیە (وێنە ١) ئینجا دێینە سەر نووسینەکانی لای سەرەوە لەناوەڕاست دەبینین EFFECTS دیارە بەماوس جارێک کلیکی لەسەردەکەین لیستێکی لێ دەبێتەوە لەناوە راستی ئەم لیستە نوێیە AMPLITUDE هەیە دێینە سەری لیستێکی تری لێدەبێتەوە لەم لیستە NORMALIZE هەیە بەماوس یەکجار کلیک دەکەین ئینجا دوا لیست بەدیاردەکەوێت ئەویش بەم شێوەیەیە (وێنە ٢) (وێنە ٣) ئینجا لەم دوا لیستە چەند بۆشاییەک دیارە لەسەرەوە ژمارەی ١٠٠ نوسراوە ئینجا بەزیادکردنی ژمارەی ١٠٠ دەنگەکە زیاتر دەبێت هەروەها بەکەم کردنەوەی ئەم ژمارەیە دەنگەکە کەم دەبێتەوە.




وینەی (٢)




وینەی (٣)

# ٣٨ ڕێنمایی بۆ خێراکردنی کۆمپیوتەر

زنجیرەی دووەم




وێنەی (١)

شاخەوان عمر حسن
shakhawano@yahoo.com

**٥- خێراکردنەوەی سیستەم:**

مەبەست کاتی کردنەوەی کۆمپیوتەر کاتێکی دەوێ تاکو کۆمپیوتەر بەتەواوەتی دادەمەزرێت و دادەگیرسێت جا لێرەدا بونی بەرنامە لە ستارت ئەپ کاریگەری دەبێت لە سەر خێرایی و خاو کردنەوەی سیستەمی کۆمپیوتەر جا بۆ ئەوەی ئەم کردارە خێرا بکەین پێویستە بەرنامە ناپێویستەکان لەسەر ستارت ئەپ لابەرین، یان هەوڵبدەین هیچ بەرنامەیەک لەکاتی کردنەوەی کۆمپیوتەر دانەگیرسێت، بۆ جێبەجکردنی ئەم کردارەش لە ژمارەکانی پێشوی گۆڤاری کۆمپیوتەر باس کراوە .

**٦- کارپێکردنی DMA هاردی کۆمپیوتەر:**

بەتەواوەتی پشت بە سیستەمی DMA دەبەستێت یان بەواتایەکی تر هەموو ئەو زاکیرانەی کە خێراییان لە ٣٣ مێگا بایت لە چرکەیەک زیاترە کە پێیان دەوترێ گەیشتن راستەوخۆ بۆ زاکیرە "الوصول المباشر للذاكرة"DIRECT MEMORY ACCESS DMA) کەبریتیە لە گواستنەوەی زانیاری بۆ زاکیرە جا ئەگەر ئەم خزمەت گوزاریە چالاک بێت سودی زۆر دەبێت بۆ خێراکردنی کۆمپیوتەرەکەت چونکە لەهەندێ لە ڤێرژنەکانی ویندۆز ناچالاکن بۆ ئەوەی بزانین چالاکە یان نا لە سیستەمی کۆمپیوتەری ئێمە پێویستە لە ناو کۆنترۆل پەنەڵەوە بچینە (SYSTEM)

لەویش کلیک لەسەر (HARDWARE) دەکەین پاشان (DEVICE MANAGER) هەڵدەبژێرین ئینجا بەدوای( /IDE ATA ATAPI ) دەگەڕێین کە دۆزیمانەوە دوو کلیک لەسەری دەکەین، بڕوانە وێنەی ژمارە (١)، دواتر لەسەر (PRIMARY IDE CHANNEL) بەهەمان شێوە دوو کلیک دەکەین ئینجا بۆکسێک دەکرێتەوە بڕوانە وێنەی (٢)، کە وێنەی بۆکسەکەیە ئینجا کلیک لەسەر بەشی (ADVANCED SETTINGS) دەکەین ئینجا ئەگەر DMA بونی هەبوو ئەوا چالاکە ئەگەر نەبوو ئەوا دەبێت دایبەزێنیت بەم شێوەیە دەر دەکەویت (DMA IF AVAILABLE)، ئەگەر نەبوو ئەوا لەم ماڵپەرە وەریبگرە و دایبەزێنەو دایمەزرێنە .WWW.INTEL COM .......

### ٧- دژە ڤایرۆسەکان:

لە ڕاستیدا دژە ڤایرۆسەکان زۆر کاریگەر دەبن لە سەر خاوکردنەوەو سست کردنی فەرمانەکانی کۆمپیوتەر چونکە ئەم دژە ڤایرۆسانە بەشێوەیەکی خۆکاری هەموو ئەو فایل و ماڵپەڕەکان و هەر کردارێک کە جێبەجێی بکەیت دژە ڤایرۆسە دەیپشکنێت ئەمەش کرداری بە جێهێنان دوا دەدەخات، بۆیە وا پێویست دەکات کەوا هەمیشە ئەو دژە ڤایرۆسانە دابنێین کە توانایەکی باش و کاریگەریشیان نەبێت لە سەر خێرایی کۆمپیوتەر وەکو (AVG. KASPERSKY ) بەڵام نۆرتن یەکێکە لە دژە ڤایرۆسەکانی بەتواناکان و بەڵام کۆمپیوتەر خاو دەکات یان باشترە هەمیشە بە کۆمەڵێک کاری تر هەولبدەین کۆمپیوتەرەکانمان بپارێزین وەکو دەست کاری نەکردن و نەکردنەوەی هیچ کام لەو فایل و سیدیانەی کە مەترسی ڤایرۆسیان لێدەکرێت.




وێنەی (٢)

# هەندێ لە بەکارهێنانە گرنگەکانی بۆردی دوگمەکان (کیبۆرد)

ئا: محەمەد حوسێن
cfebs616Azbipp/dpn

| دوگمەکان | جۆری فەرمان |
|---|---|
| CTRL + A | دیاری کردنی هەموو شتەکانی سەر فایلەکە |
| CTRL + B | نووسین بە حەتێکی تۆخ |
| CTRL + C | لەبەر گرتنەوە |
| CTRL + D | کردنەوەی دایلۆگ بۆکسی ئامادەکاری نووسین |
| CTRL + E | نووسین لە ناوەڕاستی پەڕە |
| CTRL + F | گەڕان Find |
| CTRL + G | گواستنەوە لە نێوان ووشە و دێڕ و لاپەڕەکانی نووسین |
| CTRL + H | لە جیاتی دانان |
| CTRL + I | لار کردنەوەی نووسین |
| CTRL + J | ڕێك خستنی نووسین |
| CTRL + L | ڕیکخستنی نووسین لە لای چەپی پەڕە |
| CTRL + M | جولاندنی دەقێك یان بەشێکی دیاری کراو بۆ لای چەپ |
| CTRL + N | کردنەوەی فایلی نوێ |
| CTRL + O | کردنەوەی فایلی خەزن کراو |
| CTRL + P | چاپ کردن |
| CTRL + R | ڕێکخستنی نووسین لە لای ڕاستی پەڕە |
| CTRL + S | خەزن کردنی فایل |
| CTRL + U | هێل بە ژێرداهێنانی نووسین |
| CTRL + V | دانانەوەی بەشی بڕاو یان لەبەرگیراوە |
| CTRL + W | داخستنی فایلی بەرنامەی WORD |
| CTRL + X | بڕین Cut |
| CTRL + Y | دووبارە کردنەوە ، چوونە پێشەوە |
| CTRL + Z | گەڕانەوە بۆ هەنگاوی پێشوو Undo |
| CTRL + پیتی ج | بچووك کردنەوەی بەشی دیاری کراو |
| CTRL + پیتی د | گەورە کردنی بەشی دیاری کراو |
| Ctrl + TAB | دانانی بۆشایی لە شوێنی مەبەست بۆ نووسین |
| Ctrl + Insert | هەمان کرداری لەبەر گرتنەوەی بەشێکی دیاری کراوە |
| ALT + TAB | گواستنەوە لە نێوان ( ویندۆ ) کراوەکاندا |
| Alt + سەهمی لای ڕاست | گواستنەوە بۆ لاپەڕەی پێشتر |
| Alt + سەهمی لای چەپ | گواستنەوە بۆ لاپەڕەی دواتر |
| Alt + D | کردنەوەی بەشەکانی شریتی وێنەکێشان، گواستنەوەی نیشانەکە بۆ ناونیشانی سایت |
| Alt+F4 | داخستنی ویندۆ کراوەکان |
| Alt + Space | کردنەوەی لیستی کۆنترۆڵی جوارچێوە لەلای چەپی شریتی ناونیشان |

| | |
|---|---|
| Alt + Esc | نیشان دانی هەر یەکێك لە ویندۆ کراوەکان |
| SHIFT+ Alt چەپ | گۆڕینی زمانی نووسین لە عەرەبی بۆ ئینگلیزی |
| SHIFT+ Alt ڕاست | گۆڕینی زمانی نووسین لە ئینگلیزی بۆ عەرەبی |
| F2 | فەرمانێکی خێرایە بۆ گۆڕینی ناوی فایل ( Rename ) |
| F3 | گەڕان بە دوای فایلێکی دیاری کراودا |
| F4 | نیشاندانی ناونیشانەکانی ئینتەرنێت کە لە شریتی ناونیشاندا هەیە |
| F5 | هەمان کاری ( CTRL+G ) واتە گواستنەوە لە نێوان ووشە و دێڕ و لاپەڕەکانی نووسین |
| F11 | گەورە کردن بۆ پڕاوپڕی شاشە ( وێنە یان لاپەڕەی ئینتەرنێت ) |
| HOME | گواستنەوە بۆ سەرەتای لاپەڕە |
| END | گواستنەوە بۆ کۆتایی لاپەڕە |
| Page Up | گواستنەوە بۆ سەرەوەی لاپەڕە (بەیەك لاپەڕەی شاشە) |
| Page Down | گواستنەوە بۆ خوارەوەی لاپەڕە (بەیەك لاپەڕەی شاشە) |
| TAB | گواستنەوەی نیشانەکە لە نێوان بەشەکانی لاپەڕە و ناونیشانەکاندا بۆ پێشەوە |
| SHIFT + TAB | گواستنەوەی نیشانەکە لە نێوان بەشەکانی لاپەڕە و ناونیشانەکاندا بۆ دواوە ( پێچەوانە ) |
| SHIFT + END | دیاری کردنی نوسراوەکە لە شوێنی دانانی نیشانەی ماوسەکە تا کۆتایی دێڕەکە |
| SHIFT + Home | دیاری کردنی نوسراوەکە لە شوێنی دانانی نیشانەی ماوسەکە تا سەرەتای دێڕەکە |
| SHIFT + Insert | دانانەوەی بەشی لەبەرگیراوە ( Paste ) |
| SHIFT + F10 | کردنەوەی لیستی پێویست ( هەمان دەوری کلیکی ڕاست ئەبینێ ) |
| SHIFT + سەهمی ڕاست / چەپ | دیاری کردنی بەشێك بەرەو لای ڕاست یان لای چەپ |
| Ctrl+ SHIFT ڕاست | ئاڕاستەی نووسین لە ڕاست بۆ چەپ (ئاراستەی عەرەبی) |
| Ctrl + SHIFTچەپ | ئاڕاستەی نووسین لە چەپ بۆ ڕاست (ئاراستەی ئینگلیزی) |
| Ctrl +Enter | هەڵدەستێت بە نووسینی (www... com)<br>بۆهەر ناوێك کەبینووسی لە شوێنی ناونیشان لەدۆزەرەوەی ئینتەرنێت دا |
| دوگمەی ویندۆز + D | بچووك کردنەوەی هەموو ویندۆ کراوەکان<br>بۆسەر تاسك بار، وە دووبارەی بکەرەوە هەموویان وەکو خۆیان لێ دێتەوە |
| دوگمەی ویندۆز + E | کردنەوەی دۆزەرەوەی ( Explorer ) ی ویندۆز |
| دوگمەی ویندۆز + F | ویندۆی گەڕان بە دوای فایل دا |
| دوگمەی ویندۆز + M | بچووك کردنەوەی هەموو ویندۆ کراوەکان بۆسەر تاسك بار ، وە دەر کەوتنی دێسك تۆپ |
| دوگمەی ویندۆز + R | نیشاندانی خانەی جێ بەجێ کردنی فەرمان (Run) |
| دوگمەی ویندۆز + F1 | کردنەوەی سەنتەری یارمەتی و ڕوونکردنەوە |
| دوگمەی ویندۆز + TAB | هاتو چۆ لە نێوان ویندۆ کراوەکان دا |
| دوگمەی ویندۆز + BREAK | نیشاندانی تایبەتمەندی یەکانی نیزامی (سیستمی) کارکردنی کۆمپیوتەرەکە |
| دوگمەی ویندۆز | کردنەوەی لیستی دەست پێکردن ( Start ) |
| دوگمەی ویندۆز لە گەڵ ئەو دوگمەی وەکو لیستێکە لە تەنیشتی | کردنەوەی لیستی پێویست ( هەمان دەوری کلیکی ڕاست ئەبینێ ) |




# زانکۆ لە ماڵەکەت

**و: لە عەرەبییەوە: بشری کاکە**

لە سەرەتادا بڵاوبوونەوەی ئنتەرنێت تاکە ڕێگا بوو بۆ وەرگرتنی زانیاری و کات بەسەربردن، بەڵام لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو زانستی کۆمپیوتەر خزمەتگوزاریەکانی ئنتەرنێت زۆر پێشکەوتنیان بە خۆوە بینی و ڕۆژانە ڕوو لە پێشکەوتن و بەرەو پێش چوونە کە لە هەموو بوارەکان دەتوانین بەکاریان بێنین بەتایبەتی لە بواری خوێندندا کە سوودێکی باشی بەخشیوە بە قووتابیان. پێش دەرکەوتنی ئەم ئامێرە قووتابی لەسەری پێویست بوو قوناغەکانی خوێندن ببڕێت دواتریش بۆ تەواو کردنی خوێندن ڕوو لە زانکۆکان بکات: بەڵام ئێستا جیاوازیەک هەیە لەگەڵ پێشوو کە ئێستا لە وولاتانی ئەوروپادا پەیرەو دەکرێت کە خوێندکاران هەر لە ماڵەکانی خۆیاندا دەتوانن بەشداری خوێندنی زانکۆ بکەن بێ ئەوەی بچن بۆ زانکۆ دواتریش بۆ تاقیکردنەوەکان هەمان کار دەکەن واتا هەر لە ڕێگای ئەنتەرنێتەوە بەشداری دەکەن لە تاقی کردنەوەکان ئنجا لێرەدا دەمەوێ بڵێم ئایا لەو بڕوایە دایت ڕۆژێک لە ڕۆژان لە هەرێمی کوردستاندا خوێندکارانی زانکۆ بتوانن لە ماڵەکانی خۆیاندا ئەو کارە بکەن و بەردەوامی بدەن بە خوێندنی باڵا هەر وەکوو گوتمان کە ئێستا ئەو جۆرە خوێندنە لە ئەوروپادا پەیرەو دەکرێت؟ ئنتەرنێت ئێستا لە بواری تەکنیکیەوە ئەوەی بە دەست هێناوە .تۆڕەکانی ئنتەرنێت گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە بتوانێ زانیاری بگوازێتەوە بۆ هەموو قووتابیان لە سەرتاسەری جیهان و ئەوانەی پەیوەندی بە ئنتەرنێتەوە دەکەن بەو پرۆگرامانەی کە بەرهەم هێنراوە بۆ گفت و گۆ کردنی ڕاستە و خۆیی و هەروەها بۆ وەرگرتن و ناردنی پۆستی ئەلکترۆنیش کە ئەویشیان کار ئاسانیکی زۆر دەکات بۆ قوتابیان کە ڕۆژانە مامۆستایان لە ڕێگای ئەو پۆستانەوە وانەکانی ڕۆژانە بۆ خوێندکارەکان دەنێرن و قوتابیانیش ئەو زانیاریانەی کە پێویستیان پێی دەبێت هەر لە ڕێگای پۆستی ئەلکترۆنیەوە داوا لە مامۆستاکانیان دەکەن، ئنجا لێرەدا با ئێمە گرنگی ئەم ئامێرە لە یاد نەکەین کە ئەو هەموو خزمەتەی بە مرۆڤایەتی کردووە .شایانی باسە وولاتی ئەمریکا بە هاوبەشی لەگەڵ ئەوروپا هەستان بە تەرخان کردنی (١٠) دە یەها ملیار دۆلار بۆ بواری فێربوونی ئەلیکترۆنی ڕاستەوخۆ لەماوەی ئەمساڵ لەگەڵ ئەوەی کە ئەم وولاتانە خاوەنی کۆنترین و گرنگترین زانکۆن لە جیهاندا.

سەرچاوە: گۆڤاری زەهرة الخلیج.

# بەکارهێنەرانی سیستەمەکانی کۆمپیوتەر




**بێستون عمر**

له راستیدا ئێمه له کوردستان به شێوەیەکی گشتی ئاشناین به سیستەمی ویندۆز کەمێکیش به لینۆکس بەلام زیاتر له سیستەمی ئیشپێکردنی کۆمپیوتەر هەن هەر یەکەشیان خاوەنی تایبەت مەندی و سودو باشی و خراپین بۆ نمونه لینۆکس به بەهێزترین سیستەمی ئیشپێکردنی کۆمپیوتەر له روی پارێزگاری ئەمنی دادەدەنرێت بەلام بەر بلاوترین و زۆرترین ئیشپێکەر بریتیه له سیستەمی ویندۆز له هەمان کاتدا سیستەمی تر هەن که به توانایی و سیستەمی باش دادەنرێن بەلام بەشێوەیەکی گشتی سیستەمی ویندۆز ئاسانترین و مەرن ترین سیستەمه که دەتوانێت لەگەڵ کۆی گشتی ئەو بەرنامانەی که دروست دەکرێن هاورێ و هاوتا بێت، دوا ڤێرژنی ئەم سیستەمه بریتیه له لۆنگ هۆرن که به بەهێزترین سیستەم و پێشکەوتوترین سیستەمی کۆمپیوتەر دادەنرێت ب سالی ٢٠٠٦ تاکو ئێستا بەپێی ئامارێک که مالپەری (WWW.IRAKNA.COM) تۆری هەول عیراقنا بلاوی کردۆتەوە که تایبەته به بەکارهێنەرانی سیستەمی ئیشپێکردنی کۆمپیوتەر و بەرنامەکانی هەلدانەوەی پەرەکانی وێب بەم شێوەیه بووە:

١ – سیستەمی ویندۆز WINDOWS ٩٥,٢٦ ٪
٢ – سیستەمی لینۆکس LINUX ٠,١٥٦ ٪
٣ – سیستەمی MAC/PPC ٠,٣١٣ ٪
سیستەمی FREEBSD ٠,٠٠ ٪
سیستەمی SUNOS ٠,٠٠٪
سیستەمی IRIX ٠,٠٠ ٪
سیستەمی BEOS ٠,٠٠٪
سیستەمی OS/2 ٠,٠٠٪
سیستەمی AIX ٠,٠٠ ٪
سیستەمەکانی تر ٤,٠٧٢

بەکارهێنەرانی بەرنامەکانی پەڕ هەلدەرەوەی وێب:
١- LAUNCH INTERNET EXPLORER BROWSER ٩٣,٢٦
٢ – FIREFOX ٢,١٣٠٪
٣- NETSCAPE ٣,٠٦٣٤٪
٤ – OPERA ٠,٠٠ ٪
٥ – KONQUEROR ٠,٠٠ ٪
٦ – LYNX ٠,٠٠٪
٧ – ئەوانی تر ٠,٩٧١٪

لەمەدا دەرەکەوێت کە زۆرترین بەکار هێنران بریتین له بەکارهێنەرانی سیستەمی ویندۆز و پەڕ هەلدەرەوەی هەمان کۆمپانیا ئەمەش لەبەر ئاسانی بەکارهێنانی.

# بەکارهێنانی وەرگێڕان بۆ زمانەکان لەناو وۆرد دا

ئا: اسحاق

زۆربەی ئەو کەسانەی کە کاری تایپ پێست دەکەن زۆر جاری واهەیە تووشی وەرگێڕان دێت لە بواری نووسینیدا وەکو لە زمانی عەرەبییەوە بۆ زمانی ئینگلیزی وەبەپێچەوانەوە بۆیە دەتوانن بەئاسانی لەناو WORD دا وەرگێران بکەن.

وەکو دەیبینین لەسەرەتا بەرنامەی WORD دەکەینەوە دەچینە سەر کەرەستەکان واتە ادوات (TOOLS) لەویشەوە بۆ زمانەکان لغة LANGUAGE وە لەویشەوە بۆ وەرگێر (ترجمە)



پاشان دەچینە سەر (نص) ئەو وشە دەنوسین کە دەمانەوێ مانای بزانین.



وەهەروەها ئەو زمانەی کەدەمانەوێ بۆی وەرگێڕین.



پاشان لێدانی وەرگێڕەکە (انتقال الی) دەکرێت مانای ووشەکە بۆمان دەردەکەوێت.



وێنەی (١)

# سیستەمی Beos

کامەران خۆشناو – شەقڵاوە
Kameran76@walla.com

لەم بابەتەدا باس لە سیستەمێکی کارپێکردن دەکەین بەنێوی BEOS V5 FOR PERSONAL، کە دادەنرێت بە ئەفسەرێکی نادیار لە نێو هەموو سیستەمەکانی تر .

زۆربەی زۆرمان زیاتر تەرکیزمان کردۆتە سەر سیستەمی ویندۆز بە هەموو ڤێرژنەکانیەوە، لەبەرئەوە پێم خۆشبوو ئەم سیستەمە تازەیەتان پێ بناسێنم، بۆ ئەوەی شارەزاییتان بەسەر هەموو سیستەمەکان هەبێت، نەوەکو تەنها ویندۆز وە لەم بابەتەدا ئەم باسانە دەخەینە ڕوو:-

١- سیستەمی کارپێکردن چی یە؟
٢- سوودی سیستەمی کارپێکردن چی یە؟
٣- نمونە لەسەر سیستەمی کارپێکردن.
٤- کورتەیەک لەسەر سیستەمی BEOS.
٥- ئایا ئامێرەکەم کاربەم سیستەمە دەکات؟
٦- ئایا لە کوێ دایبەزێنم؟
٧- ئایا بەرنامەی بۆ هەیە؟
٨- ئایا پاڵپشتی زمانی عەرەبی دەکات؟

٩- هەندێ فەرمانی بەربڵاوو سوودەکانیان.

١٠- تێبینی یەکان.

سیستەمی کارپێکردن چەندین پێناسەی جۆراوجۆری بۆ کراوە، وە زۆربەشیان راستن، بەڵام ئەگەر ئێمە بمانەوێ پێناسەیەکی کورتی بۆ بکەین ئەویش بریتی یە لەو سیستەمەی کە هەڵدەسێ بە پێکەوە بەستن لەنێوان بەکارهێنەرو بەشە ڕەقەکانی ئامێرەکە (HARDWARE)، وە هەروەها لە نێوان بەکارهێنەرو بەرنامە کارپێکراوەکان (SOFTWARE)، وە گرنگی سیستەمی کارپێکردن زۆرن، گرنگترینیان بریتی یە لە تەنسیقی نێوان بەکارهێنەرو پارچەکانی کۆمپیوتەر، وە سیستەمی کارپێکردن زۆرن، لەوانە هەندێکیان وەکو ویندۆز – لینۆکس – ماکنتۆش – BEOS – سۆلاریس وە چەندانی تر .

ئەگەر ئێمە سیستەمی کارپێکردنی BEOS وەربگرین کە دادەنرێت بە برای یاخود ئامۆزای سیستەمی لینۆکس، وە هەروەها ئەم سیستەمە یەکێکە لەخانەکانی لینۆکس، وە دەتوانین ئەم سیستەمە دابەزێنین لە نێو سیستەمی ویندۆز، وە هەروەها لەنێو لینۆکس، وە ئەم سیستەمە پێویستی بە ٥٠٠ میگابایت بۆشایی هەیە بۆ دابەزاندنی لەسەر ویندۆز بەهەموو ڤێرژنەکانیەوە، تەنها ویندۆزی میللینیۆم نەبێت پێویستی بەکردارێکی زیاتر هەیە پاش دابەزاندنی کە زۆر ئاسانە، لەسەر ڕووبەری شاشە کورتکراوەیەک دروست دەبێت، کاتێک کلیکی لەسەر دەکەێن دەچێتە نێو سیستەمی BEOS .

ڕووکاری گشتی سیستەمی BEOS وەکو لە وێنەکانی ژمارە ١ و ٢ و ٣ دا دیارە.

١- لیستی بەرنامەکان کە ئامادەن بۆ کارپێکردن وەکو بەرنامەی ICQ و بەرنامەی نامەی ئەلیکترۆنی و بەرنامەی گرتنی وێنە .

٢. لاپەڕە هەڵدەرەوەی وێب ....... (پاڵپشتی زمانی عەرەبی ناکات ) .

٣- لیستی ئەو بەرنامانەی هەن لە نێو سیستەمەکە .

٤- بەرنامەی نامەی ئەلیکترۆنی .

٥- بەرنامەی ICQ .

٦- مەلەفێکی زۆر سادە بۆ یەکێک لەیارییەکان بە نێوی GEEKCODE .

٧- بۆ گەیشتن بە مەلەفەکانی ویندۆزو بینینیان.

٨- پەڕهەڵدەرەوە کە پاڵپشتی زمانی عەرەبی ناکات.




وێنەی (٢)

٩- بەرنامەی مامەڵە کردن لەگەڵ مەلەفاتی پەستێنراو و کردنەوەی پەستێنەرەکە.

١٠- بەرنامەی دامەزراندنی پەیوەندی کردن لەگەڵ ئنتەرنێت.

١١- لیستی ئەو بەرنامانەی ئامادەن لە نێو سیستەمەکە، لە نێوانیاندا وە گرنگترینیان بەرنامەی TERMINAL .

١٢- لێرەوە دەتوانین وێنە بۆ پشتەوەی شاشە دابنێین .

**چەند تێبینی یەکی گرنگ**

**تێبینی یەکەم:**

بۆ بەکارهێنەرانی ویندۆز میللینیۆم ئەم سیستەمە لەسەر سیستەمەکەتان کارناکات، بەڵکو دەبێ بچن بۆ لیستی ئەو بەرنامەیە لە لیستی بەرنامەکان وە CREATE BOOT FLOPPY هەڵبژێرن، یاخود پاش RESTART کردنەوەی ئامێرەکە فلۆپیەک بخەرە نێو درایڤەری فلۆپی، پاشان دەبینین سیستەمەکە کاردەکات.

**تێبینی دووەم:**

دەتوانین ئەم سیستەمە دابەزێنین لە ئنتەرنێتەوە، لە ڕێگای سایتی WWW.BEOS.COM، یاخود لە سایتی WWW.DOWNLOAD.COM،وەهەروەها دەتوانین لەهەمان سایتەوە بەرنامەکانی دابەزێنین.

**تێبینی سێیەم:**

بۆ دابەزاندنی بەرنامە جۆراوجۆرەکان پێویستە جۆرەکانی دابەزاندنی ئەم بەرنامەیە بزانین کە بریتین لە:-

**دابەزاندنی ئاسان:**

ئەم جۆرە بەرنامانە فۆرماتیان PGK یە، ئەوەی پێویستە لەسەرت ئەمەیە کە تۆ کلیک لەسەر ئەم ئایکۆنە بکەیت، بۆ ئەوەی ویزاردی دابەزاندن دەست پێ بکات.

**دابەزاندنی قورس:**

وەکو یاری GEEKCODE کە پێش ئێستا باسمان کرد، بۆ ئێش پێکردنی پێویستە بچین بۆ بەرنامەی TERMINAL، پاشان بۆ دایرێکتەری بەرنامەکە، وە پاشان نووسینی ناوی بەرنامەکە، لە دوواییدا کردارەکە دەست پێدەکات .

**تێبینی چوارەم:**

سیستەمی BEOS هەموو جۆرە پێکهاتەکانی ژیانی تێدایە، هەروەها پاڵپشتیەکی تەواوی هەیە بۆ هاردوێرەکان، وە دەتوانین پێناسەکانیان وەرگرین لە سایتی تووکاوز و ZDNET .

**تێبینی پێنجەم:**

سیستەمەکە لە ڕووی پەرهەڵدەرەوە پاڵپشتی زمانی عەرەبی ناکات، بەڵام پەرهەڵدەرەوەیەکی تر هەیە بە نێوی BAZILLA، کە پاڵپشتی زمانی عەرەبی دەکات، وە دەتوانین لەسەر ئەم سیستەمە دایبەزێنین.

**تێبینی شەشەم:**

دەتوانین فۆڵدەرەکانی ویندۆز یاخود هەر سیستەمێکی تر ببینین لە نێو سیستەمی BEOS، ئەویش بەکلیک کردنی ڕاستەی ماوس لەهەر شوێنێک وە هەڵبژاردنی MOUNT، وە دیاری کردنی هەر سیستەمێک کە بمانەوێت.



وێنەی (٣)



# کردنەوەی کتێبخانەی ئەلیکترۆنی لە کتێبخانەی گشتی هەولێر

لەڕێکەوتی (٢٠٠٦/٣/١٣) بەئامادەبونی وەزیری ڕۆشنبیری و کارمەندانی وەزارەتی ڕۆشنبیری و ژمارەیەك لە ئامادەبوان لەلایەن کۆمپانیای (فیدڕاڵ) بەهاوکاری کۆمپانیای (دانا سۆفتی) ئێرانی کتێبخانەی ئەلیکترۆنی لەکتێبخانەی گشتی هەولێر کرایەوە. کەئەمەش هەنگاوێکی پێشکەوتن خوازە بۆ بەرەو پێش چوونی کتێبخانەی کوردی و هەروەها کارئاسانیە بۆ ئاشنایانی کتێب وخوێنەران وچینی قوتابیان.

ئا: ڕێناز ئەردەلان بەکر

## زانیاری پڕۆژەکە

ئەم پڕۆژەیە هەڵدەستێت بەدابەزاندنی نوسخەیەک کەبریتیە لەبەرنامەیەکی تایبەت بەکتێبخانە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری کتێبخانــە، وەکــو: ئیدخــاڵ، تەســجیلی کتێب، گۆڤــار، مەقالە، ڕۆژنامــە، ســی دی (TAPE) مایکرۆ فیلم (کەبەگشــتی دوازدە جۆر DOCUMENT دەگرێتەوە) و بەکار دەهێنرێت لەکتێبخانەی گشــتی هەولێر بەرنامەی ناوبراو بەزمانی کوردی و ئینگلیزی ئیــش دەکات بــەڵام ئیدخاڵ و تەســجیل دەتوانــرێ بەکوردی عەرەبی فارسی و ئینگلیزی بێت.

### هەر بۆ زیاتر زانیاری بەڕێز ڕەحمەتی گەنجی مامۆستای خول گوتی:

ئــەم پڕۆژەیە بۆ دیجیتاڵ کردنی کتێبخانەیە بۆ داخل کردنی کتێبەکانە بە چوار زمان (کوردی، فارســی،ئینگلیزی، عەرەبی) دەتوانین زانیاریەکان ئیدخال بکەین . ماوەی ئەم پڕۆژەیە چوار مانگ و پانزە ڕۆژە،ماوەی خولی یەکەم چوار ڕۆژە دوای یەک مانگی تر خولەکە بەردەوام دەبێت لەمیانەی خولەکە چۆنیەتی ئیدخــاڵ کردنــی کتێبەکان بــەدوا گەڕانی ڕاپۆرتــەکان یاخود گەران بەدوایی بەڵگەنامــەکان وەک گۆڤار و ووتار. بۆئێمەش جێگای شانازیە کەکارێکی وا لەپایتەخت ئەنجام بدەین .

### بەڕێز حسێن حەسەنی بەڕێوەبەری پڕۆژەکە و بەڕێوەبەری کۆمپانیای دانا سۆفتی ئێرانی لەبارەی ئەم پڕۆژەیە گوتی:















لەسالی ڕابردوو لەگەل کۆمپانیایی فیدڕالی کوردستانی عێراق بە بەڕێوەبەری (کاگ عزەت نەجمەدین) چەند پڕۆژەمان بەڕێوە بردوە لەڕوی ئەلیکترۆنی کردنی کتێبخانەکانەوە. وە دووەمین جـارە ئێمـە لەکوردسـتان ئەم پڕۆژەیـە بە ئەنجـام بگەیەنین. لەسالی (٢٠٠٥) لەکتێبخانەی ناوەندی زانکۆی سەلاحەدین ئەم پڕۆژەیەمـان بەڕێوە بردوە . ئەو بەرنامـەش کەدامان ناوە و کاری پێ دەکەین (WINLIP) کەبەرنامەیەکە لەرێی (WINDOWS) کاردەکات بۆئەلیکترۆنی کردنی تەواوی کارو باری کتێبخانەکان .بۆ ئەم پڕۆژەیەش مامۆسـتا لەئێرانـەوە هاتوە بۆ گوتنەوەی

وانـەی لەخولەکان کەلەڕێگای (داتا شـۆ دەبـێ) زانیاری گار کـردن بەبەرنامەکە بەو کەسـانە دەدرێ کە لەخولەکە بەژدار دەبن . لەبەئەنجام گەیاندنی ئەم پڕۆژەیە لەکوردستانی عێراق دوو ئامانجمان هەیە، یەکیان ئەوەیە کەکوردین و پێمان خۆشە ئیشـیکمان کردبێ بۆئێرە چونکە دەزانیـن کاری کۆمپیوتەری لێرەدا سـاوایە، لایەنـی دووەم کاری بازرگانیە کاتێک کارێک دەکەین دەتوانین بەباشـی بەڕێـوەی بەرین دەتوانین خزمەت بگەیێنین چونکە بەزاراوەکە ئاشناین .

# بەرنامەی Craagle بۆ گەڕان بەدوایی (crack) و(serial number) ی بەرنامەکان




وێنەی (١)

ئا: نەوزاد رؤوف

بەرنامەی CRAAGLE هاوشێوەی سایتی (GOOGLE)ە بۆ کاری گەڕان، بەلام ئەم بەرنامەیە تایبەتە بەگەڕان بەدوای CRACK و SERIAL NUMBER و REGISTER CODEی بەرنامەکان.

زۆرجار کە بەرنامەیەک SETUP دەکەین ئەوا داوای SERIAL NUMBERیان CRACK کردنمان لێدەکات. ئەگەر (SERIAL NUMBER) یان (CRACK) مان هەبوو ئەوا هیچ کێشەیەک نیە، بەلام زور جار دەبینین ئەو بەرنامەیەی کە دەمانەوێت SET UPی بکەین ئەوا (SERIAL NUMBER) یان(CRACK) ی لەگەڵ دانی یە . لەم کاتەدا دەتوانین سوود لەم بەرنامەیە وەربگرین. سەرەتا کە بەرنامە کە دەکەینەوە بەم جۆرەیە (وێنەی ١).

ئەو بەرنامەی کە مەبەستە لە خانەی (SEARCH) دەنووسیت وەهەروا وا باشە کەوا ڤێرژنی بەرنامەکەش بنووسی. بۆ نموونە ئەگەر بەدوای بەرنامەی PDF2WORD گەڕایت ئەوا لە خانەی (SEARCH) بنووسە PDF2WORD (V1.4) .بەمەرجێک دەبێت کۆمبیوتەرەکەت لەگەڵ هێلی ئینتەرنێت پەیوەست بێت،چونکە ئەم بەرنامەیە لەگەڵ ١٣ سایتی تایبەت بە گەڕان بەدوایی سیریال وکراک لینک کراوە.

دوایی کەمێک چاوەڕوانی ئەو فایلانەت دەداتێ کە سیریال وکراکی بەرنامەکەی تێدایە کە فایلی زیپ کراون ( وێنەی ٢).

تۆش دوو کلیک لەسەر فایلی ویستراو بکە پاشان سەیڤی بکە لەشوێنێک خۆی داونلۆد دەبێت. بەم جۆرە سیریال وکراکی بەرنامەکەمان دەست دەکەوێت. (وێنەی ٣).







وێنەی (٢)

وێنەی (٣)

# بەکارهێنانی انترنێتی ئاریافۆن

## دالیاسات

تکایــە ئەمانەی خوارەوە زۆر بــەوردی جی بەجی بکە تاکو توشی گرفت نەبیت.

**تێبینی گرنگ:**

* یەکــەم جار کێبلــی USB بەکارمەهێنە لە نیوان کومپیوتەر وتەلەفۆنەکەت تا لەخوارەوە لێت داوا دەکرێت.

* لەکاتی بەکارهێنانی ئنتەرنێت لەسەر شاشەی تەلەفۆنەکەت DATA SERVICE دەنووسرێت، لەوکاتەدا تەلەفەنەکەت مەشغول دەبێت وناتوانی تەلەفۆن وەرگری ویان بکەیت، بۆ بەکارهێنانی تەلەفۆن یەکەم جار لە کۆمپیوتەرەکەت ئنتەرنێت داخە، ئەگەر DATA SERVICE هــەر مابــوو لەســەر تەلەفۆنەکــە پەنجە بنێ بــە دوگمــەی END، نابێــت دوگمەی END بەکاربێنــی لە کاتی بەکارهێنانــی ئنتەرنێــت، هەروەها نابێت کێبلی USB یەکســەر لــە کۆمپیوتەرەکەت لێکەیتــەوە، کۆمپیوتەرەکــەت بکوژێنەوە ئینجــا کێبلەکە لێ بکەرەوە (دەتوانــی تەلەفۆنەکەت بە دڵنیایی لێکەیتەوە پاش بەکارهێنانی ئنتەرنێت مەرج نیە کۆمپیوتەرەکەت بکوژێنیتەوە).

بۆ وەرگرتنی زانیاری زیاتر ئەو فایلانە بخوێنەوە کە هاتوون لە سی دی:

HUAWEI ETS SERIES FIXED WIRELESS TERMINAL"
"DATA SERVICE ELECTRONIC DOCUMENTATION

چۆنێتــی دانانــی ئنتەرنێتــی ئاریافــۆن لــە ویندــۆز XP ((MICROSOFT WINDOWS XP

١- ســی دی (CD) بەرنامەی ئنتەرنێتی ئاریافۆن "HUAWEI FWT WIRELESS MODEM DRIVER" لەنــاو کۆمپیوتەرەکــەت دابنــێ، ئینجــا بەرنامەی SETUP لەناو فۆڵــدەری SETUP بخە کار.

٢- بەرنامەکە لێت دەپرسێ، بە چ زمانێک دەتەوێت بەرنامەکە دابنێی. زمانێک هەڵبژێرە وە OK لێبدە.




٣- ئێستا بەرنامەکە خۆی ئامادە دەکات بۆ کارکردن، باشتر وایــە هەر بەرنامەیەکی تر کرابێتەوە دای بخەیت، ئینجا NEXT لێبدە.




٤- ئێستا شــوێنی دانانی بەرنامەکە دیاری بکە،ئینجا NEXT لێبدە (وەکو خۆی لێیگەرێ).




٥- ئەگەر یەکەم جار بێت بەرنامەکە لەسەر کۆمپیوتەرەکەت دابنێیت ئەم وێنەیە دەبینیت:

**ئەمانەی خوارەوە جێ بەجێ بکە:**

ا- کێبلی USB ببەستە لە نێوان تەلەفۆن و کۆمپیوتەرەکەت.

ب- کومپیوتەرەکەت چەند ئامێرێک دەدۆزێتەوە پێویست بە ناساندن دەکات، یەکەمیان "TUSB3410 BOOT DEVICE" وەک لە خوارەوە دیارە:




ج- NEXT لێبـدە، تـا تەواو دەبێت، ئینجـا FINISH وەک لەم وێنەیەدا دیارە:







د- پاشـان کومپیوتەرەکە دەسـت بە ناساندنی ئامێرێکی تر دەکات ئەویش "TIUMP USB SERIAL PORT" وەک لە خوارەوە دیارە:




هـ-NEXT لێبدە پاشان "CONTINUE ANYWAY" ئینجا FINISH لێبدە.




٦- کـە دۆزینـەوەی ئامێـرکان تەواوبـوو، دەگەڕێتـەوە بەرنامەی پێشوو کە مابووەوە لەسەر شاشە:




Figure 3-19 Install Guide

NEXT لێبدە. ئەمە خوارەوە دەبینی:




پاشان:




دووبارە "CONTINUE ANYWAY" لێبدە، پاشان FINISH .




٧- ئێستا دانانی بەرنامەی ناساندنی تەلەفونەکەت تەواو بوو، تەنها ماوە بەرنامەی پەیوەندیکردن بە ئنتەرنێتەوە بناسێنی لەسەر کومپیوتەرەکەت.

لە سەرەتادا ئەمانە یەک لەدوای یەک کلیک بکە:

START À ALL PROGRAMS À ACCESSORIES À COMMUNICATIONS À NETWORKS CONNECTIONS

پاشان لە لای چەپ کلیک بکە لەسەر "CREATE A NEW CONNECTION" ئینجا NEXT لێبدە



"CONNECT TO THE INTERNET" هەڵبژێرە ئینجا NEXT




"SETUP MY CONNECTION MANUALLY" هەڵبژێرە ئینجا NEXT



هەڵبژێرە "CONNECT USING DIAL-UP MODEM" ئینجا NEXT

ئەگەر پێشتر مودێمت دانابێ لەسەر کۆمپیوتەرەکەت ئەمەی خوارەوە دەبینی:

دەبێت "HUAWEI WIRELESS MODEM" هەڵبژێری، ئینجا NEXT. پاشان ناوێک دابنێ بۆ پەیوەندییەکەت "ARIAFON" بۆ نموونە. ئینجا NEXT.

ژمارەی تەلەفۆن #777 بنووسە لەشوێنی دیاریکراو، ئینجا NEXT لێبدە.

لە USERNAME و PASSWORD EDJV بنووسە ئینجا NEXT و FINISH لێبدە.

ئێستا دەتوانی پەیوەندی بە ئنتەرنێتەوە بکەیت بە کلیک کردن لەسەر DIAL




# کێبرکێ ماڵپەڕەکان و بەخشینی گەورەترین قەبارەی پۆستی ئەلیکترۆنی

داليا جمال -سلێمانی

هەمووی چەند ساڵێکی کەم لەمەوپێش ناردنی نامەیەک بۆ برادەرێک یان ناسیاوێک و کەس و کارمان ماندوبونێک بوو، لە هەمان کاتدا لە هەندێ لە ناوچەی جیهان ئەم خزمەت گوزاریە هەر نەبوو یان کە هەبوو مەترسی دەست کاری کردن و خوێندنەوەی ئەم نامانە زۆر بوو، لە هەمان کاتدا هیچ گرەنتیەکی گەیشتنی ئەم نامەیە نەبوو، ئەگەر چی تاکو ئێستا ئەم پۆستانە لە گرنگی نەکەوتوون چونکە پۆسە ئەلیکترۆنیەکان ناتوانن هەموو شتێک پۆست بکەن بەڵام گرنگترین شت بەلای هەموو کەسێکەوە نامەیە ئەویش ئێستا لەرێگای ماڵپەرەکان دەنێردرێن. نامە ئەلیکترۆنیەکان و گۆرینەوەیان لەنێوان بەکارهێنەرانی ئنتەرنێت زۆرترین رێژەی هەیە. واتە زۆربەی بەکارهێنەرانی ئنتەرنێت ئەم خزمەت گوزاریە بەکاردەهێنن، بەناوبانگترین ئەو ماڵپەرانەی کە پۆستی ئەلیبکترۆنی دەبەخشن (YAHOO، HOTMAIL، GOOGLE، MAKTOOB، MYWAY، MADONA) کێبرکێی لە نێوان ماڵپەڕەکان بۆ بەخشینی پۆستی ئەلیکترۆنی بە بەکارهێنەرانی وەکو جەنگێکی لێهاتووە کە لەبەرامبەردا ئێمە سودی لێوە دەبینین، مەبەست لەبەرامبەر راکێشانی زۆرترین بەکارهێنەر بۆ لای خۆیان هەریەکە قەبارەی بری پێدراو زیاد دەکەن تا کار گەیشتە ئەو رادەیەی لەماوەی ساڵێک یاهۆۆ توانی قەبارەی پۆستە ئەلیکترۆنیەکانی خۆی بگەیێنێتە ١٠٠٠ مێگا بایت واتە نزیکەی اگیگا بایت کە ئەمەش برێکی یەکجار زۆرە لەبەرامبەردا گۆگل وەکو خزمەتگوزاریەکی نوێ بۆ یەکەم جار ئەم خزمەت گوزاریە بخاتە ناو ماڵپەڕی خۆیەوەو نزیکەی ٢٠٠٠ مێگا بایت ببەخشێت ئەمە جگە لەوەی لە هەموو ئەم ماڵپەڕانەدا دەتوانیت فایلی وێنەی جوڵاوو نەجوڵاو بنێریت ئەمە لەگەڵ کۆمەڵێک خزمەت گوزاریتر کە ماڵپەرەکان دەیبەخشن بە خۆڕایی بۆیەش لەم شەڕەی ماڵپەڕەکان بۆ راکێشانی زۆرترین میوان و ئەندام بۆ ناو ماڵپەڕەکانیان ئێمە لەم ناوەدا سود مەند دەبین، نا وەک ئەوە وابێ کە منیش ریکلام بۆ هیچ کام بکەم بەڵام ئەگەر زمانی عەرەبی دەزانیت ئەوا برۆ بۆ ماڵپەڕی (WWW.MAKTOOB.COM) کە ئەویش ١٠٠٠ مێگا دەبەخشێت بە خۆرایی، ئەگەر ئینگلیزی باش دەزانیت ئەوا یاهۆو یان گۆگل باشترینیانن لەوێش ببە بە خاوەنی ئیمەیلێک.

# چۆن خێرایی ئینتەرنێتەکەت زیاد دەکەیت بەبێ بەرنامە؟

باوکی ماریا

ئازیزان . بۆ خێراکردنی هێڵی ئینتەرنێت چەندین رێگا هەیە، ئێمە هەرجارەو یەکێکیان باس دەکەین، وە ئەو رێگایەی ئەم جارە باسی دەکەین رێگایەکی بەکارهێنراوە، وە خۆشم بەکارم هێناوەو هەستم کردووە کە ئینتەرنێتەکە لەجاران خێراتر بووە، لەبەرئەوە پێم خۆش بوو بۆ ئێوەی بەرێزیش باسی بکەم،بەهیوای سوود وەرگرتن .

یەکەم جار هەڵسە بە چوونە ناوەوەی بەشی ڕیجیستری لە ویندۆز، بەم شێوەیە برۆ بۆ لیستی START پاشان لە RUN فەرمانی REGEDIT بنووسە ( وێنەی ژمارە ١)، وە بەدوای ئەم فەرمانانەدا برۆ

HKEY_LICAL_MACHINE
SOFTWARE
MICROSOFT
WINDOWS
CURRENT VERSION
EXPLORER
REMOTE COMPUTER
NAME SPACE

لە خوارەوە ئەم ژمارانە دەبینی {-D6277990-4C6A-11CF 8D87-00AA0060F5BF} (وێنەی ژمارە ٢)، ئەگەر تەئکید بووی کە ژمارەکان بەم شێوەیەن، ئەوا هەڵسە بە لابردنیان، ئەمیش لە رێگای کلیکی راستی ماوس وە هەڵبژاردنی فەرمانی DELETE (وێنەی ژمارە ٣)، تێبینی دەکەیت کەوا ئینتەرنێتەکەت خێراتر بووە.




وێنەی (١)

بۆچی بەرنامەی پەرەهەڵدەرەوەی ئینتەرنێت خێراتر بووە؟
لەبەرئەوەی لەکاتی بەکارهێناندا ڕیجیستری فەرمان ئەدا بە بەرنامەی پەرەهەڵدەرەوە کە بەدوای مەلەفاتی هاوبەشدا بگەرێ (SHARED(REMOTE)FOLDERS/FILES) لەناو تۆردا، کە دەبێتە هۆی خاوی هێڵی ئینتەرنێت .

تێبینی: ئەم رێگایە دەتوانرێ تاقی بکرێتەوە لەسەر هەموو ویندۆزەکان، وە لەسەر هەموو بەرنامەکانی پەرەهەڵدەرەوە، وە تێبینیەکی تریش ئەوەیە لەکاتی نوێ کردنەوەی بەرنامەی پەرەهەڵدەرەوە بە ڤێرژنێکی نوێ تر، دەبێ ئەم رێگایە لە ڕیجیستری دووبارە بکەیتەوە.




وێنەی (٢)




وێنەی (٣)




# پرۆتۆکۆلی ئنتەرنێت چی یە؟

نووسینی: گۆران شەقڵاوەیی
GORANKUMAR@YAHOO.COM

ئایا رۆژێک بیرت لـەوە کردۆتەوە کە ناونیشانی پرۆتۆکۆلی تایبەتی ئنتەرنێتی خۆت بزانی؟ فکرەی ناونیشانی پرۆتۆکۆلی ئنتەرنێـت (INTERNET PROTOCOL) لە فکرەی سیستەمی تەڵەفۆن هاتووە، ئەگـەر ئێمـە بگەڕێینەوە بۆ سـەرەتای شەسـتەکان کاتێـک تـۆڕی ئنتەرنێـت بـەکار دەهـات تەنهـا لە سـەنتەرەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی و زانکۆکانی ئەمریکا و وەزارەتـی بەرگری ئەمریـکا، لەمەوە بەرپرسـان هەڵسان بە بەرەو پێشبردنی تـۆڕی ئنتەرنێـت بە کەڵـک وەرگرتن لە سیسـتەمی تەلەفۆنات، ئەمیش بە دانانی ژمـارە بـۆ هەمـوو بەکارهێنـەران، بۆ ئاسان گەیشتن بە بەشداربووی تۆڕ، وە بەهۆی ئـەم ژمارەیەوە ئەتوانین وولاتی بەشـداربوو وشـارەکەی و ناوچەکـەی کە تێیدا نیشـتە جێیـە بیزانیـن، لەمەوە جیاکاری بەکارهێنەرانـی ئنتەرنێت دانرا لە ڕێگای دابەش کردنی ژمارەی تایبەت بـۆ هـەر بەکارهێنەرێـک، وە لەڕێی ئەم ژمارەیە ئەتوانین دەست نیشانی شوێنی بەکارهێنـەر بکەین، بۆ نمونە ئەگەر ئێمە ژمارەی تایبەتی سـایتی مایکرۆسـۆفت لەسـەر تـۆڕی ئنتەرنێـت وەربگریـن کـە بریتییـە لـە ( ١٩٨،١٠٥،٢٣٢،٤)، وە ژمارەکە ئەخوێنرێتەوە لەلای چەپەوە کە بریتییە لە ناوچەی جوگرافی ( دەوڵەت )، وە لەم نمونەیـەدا ژمارە ( ١٩٨) بریتییە لـە وولاتی ئەمریـکا، وە ژمارەی دووەم بریتییـە لـە ژمـارەی ناوچەکـە یاخود ژمـارەی ئـەو کۆمپیوتـەرەی کـە تێیدا بەشـداریت، وە ژمارەی سێیەم ژمارەی ئـەو کۆمپیوتەرانـە دیـاری دەکات کـە پەیوەستن بەیەکەوە لەگەڵ ئامێرەکە، وە ژمارەی چوارەم ژمـارەی ئەو ئامێرەیە کـە بەکارهێنـەر کاری لەسـەر ئـەکات، لەبەرئەوە ئاسان کاری کراوە بۆ گەیشتن بەهـەر بەکارهێنەرێـک، لەڕێـی زانینـی پرۆتۆکۆلـی تایبەت، وە هاوکاریەکیشـە بۆ دەست نیشان کردنی کەسانی تێکدەر لەسـەر تۆڕی ئنتەرنێت، ئەوانەی هەوڵ دەدەن بۆ بڵاوکرنەوەی ڤایرۆس، یاخود دزینـی پارە لە ڕێـی کارتەکانی بانکەوە، کاتێـک دەچیتە نێو هەندێ لەسـایتەکانی فرۆشـتنی کەلوپەلـی بازرگانی لەسـەر ئنتەرنێت ئاگاداری ئەوەت دەکاتەوە کەوا ئـاگادارە بـە زانینی ژمـارەی (IP)ی ئەو شـوێنەی کە لێیـەوە پەیوەندی دەکەیت، وە لەلایەکی ترەوە ژمارەی (IP) دائەنرێت بە کلیلی سەرەکی بۆ کاری دزە کردن بۆ نـاو هەر ئامێرێک، لە ڕێگای ڤایرۆس کە هەڵدەسێ بە ناردنی ژمارەی (IP) تایبەت بۆ کەسـانی تێکدەر هـەر کاتێک چوویتە نێو ئنتەرنێـت، وە چەندین بەرنامە هەیە بۆ کەشـف نەکردنی ژمارەی (IP) تایبەت کـە گرنگترینیـان FIFE M وە چەندانـی تر کـە بـڵاو کراونەتەوە لەسـەر تۆڕی ئنتەرنێت، لە کۆتاییـدا ئەتوانین ژمارەی (IP) تایبەت بزانین بەم شێوەیە :-

بڕۆ بۆ لیسـتی START وە دوایی RUN وە دەسـتەواژەی WINIPCFG بنوسـە پاشـان OK بکە، دەبینیت سـندوقێکت بۆ دەکرێتەوە ژمارەی (IP) پێ دەڵێ .

# ماڵپەڕێکی بەهێز بۆ گەڕان

ئا: سالار کامەران

ئێستا زیاتر وە زۆر زیاتر لە ٢١٠ بلیۆن پەڕەی وێب لەناو سایتەکانی ئنتەرنێت دا هەن، گەیشتن پێیان یان بەو ماڵپەڕانەی کە ویستی ئێمەن ئەوەندە ئاسان نیە یان ئەوەتە ماندوبونێکی زۆری دەوێت. لەگەڵ ئەمەشدا لەبەر زۆری پەڕەکان زۆربەی جار دۆمەینەکان بەناوی خۆیان دانانرێن چونکە ناوەکان بەیەک دەچن و تۆری ئنتەرنێت ئەمە قبول ناکات هەربۆیەش بەچەندەها ناوی جۆراو جۆر بلاو دەکرێنەوە، بۆ نمونە ماڵپەڕە کوردیەکان بەسەدان هەزار دەخەملێن




وێنەی (١)




وێنەی (٢)

کەچی هەریەکەو ناوێکی هەیە، بۆیەش گەیشتن بەناوی مەبەست یان زانیاری مەبەست گران و کاتێکی زۆری دەوێت، بۆ ئاسانکاری ئەم کارەش چەندان بزوێنەری گەران داهێنراون کە لەسەروی هەرهەمویان (GOOGLE) ە کە بەهێزترین و خێراترین بزوێنەرە بەدوایدا (YAHOO) دێت، بەلام گوگل ناتوانێت تەواوی ماڵپەرەکان جیابکاتەوە بۆ نمونە ناتوانێت ماڵپەری تایبەت بە (MP3) بدات یان تایبەت بە فلیم و گورانی یان ماڵپەری ڤیدیۆیی، بەلام یاهۆو تاڕادەیەکی باش دەتوانێت. هەروەها زۆر ماڵپەری تریش هەن وەک (INDEX.COM.GO.COM SEARCH.COM) لەسەروی ئەمانەوە ماڵپەرێکی تر هەیە بەناوی (MYSEARCH.COM) وێنەی (١) روکاری ماڵپەرەکەیە، کە دەتوانێت فایلەکانی تایبەت بە (MP3) و فایلی ڤیدیۆی و وێنەو هەواڵنامەو و گەران لەناو چەندان بزوێنەری تر پێش کەش بکات زۆر بەوردی و زۆر بەخێرایی بۆ نمونە ئێمە لە (MP3) داوای زەکەریامان کرد بەم شێوەیە گورانیەکانی ریز کردون وەک لە وێنەی (٢) دیارە لەهەمان کاتدا ئەم ماڵپەرە بۆ گەران سود لە زۆربەی ماڵپەرەکانی تر وەردەگرێت. لەهەمان کاتدا داواکاریەکان ریز بەند دەکات بەگوێرەی نوسین و داواکاری بەکارهێنەرەکان.

# مانای ئەو ژمارانەی کە لەکاتی پەیوەندی بە ئەنتەرنێتەوە دەردەکەون لەکاتی بوونی هەڵە

حسن عمر حسن

## زنجیرەی دووەم

٦٣١- پچرانی پەیوەندی مۆدێم بە بەکارهێنەر.
٦٣٢- گرنگ نیە.
٦٣٣- مۆدێم لەکار دایە یان ئەوەتا ناتوانێت مۆدێم پەیوەندیەکە بگەیێت.
٦٣٤- ببورە پەیوەندیەکەت بە سەنتەری توری ئنتەرنێتەوە دورە.
٦٣٥- هەڵەیەکی نەزانراو هەیە.
٦٣٦- ئەو ئامێرەی بە مۆدێمەوە بەستراوە نەناسراوە.
٦٣٧- بەدوای جێبەجێکاریەکە برۆ چونکە هەڵە هەیە.
٦٣٨- گرنگ نیە.
٦٣٩- هیچ ئاماژەیەکی بونی توری ئنتەرنێت نیە.
٦٤٠- هەڵەیەک هەیە لە NET BIOS.
٦٤١ -گرنگ نیە.
٦٤٢- یەکێک لەناوەکانی NET BIOS تۆمارکراوە لەلایەن کەسێکی ترەوە لەدورەوە.
٦٤٣- پەیوەندیەکەت هەرەسی هێنا هەوڵێکی تر بدە.
٦٤٤- ئاماژەکانی پەیوەندی کردن ناگەنە ناوەندی تورەوە.
٦٤٥- هەڵەیەک لەناوەوە رویدا.
٦٤٦- ناتوانیت پەیوەندی بکەیت بەئنتەرنێتەوە تەنها ئەمرۆ.
٦٤٧- حسابەکەت داخراوە.
٦٤٨- کوتایی بە ژمارەی نهێنیەکت هات بۆ ئەم حسابە.
٦٤٩- حسابێکی تایبەت بەخۆت نیە بۆ کردنەوەی پەیوەندی تەلەفۆنی.
٦٥٠- هیچ وەلامێک نیە لەدورەوە.
٦٥١- بەدوای هەڵەکانی مودێم دا بگەرێ.
٦٥٢- وەلامێکی نەزانراو لە مۆدێم دا هەیە.
٦٥٣- نەیتوانی ماکرۆی داواکراو لە مۆدێم بدۆزێتەوە لەپارچەی DEVICE لە فایلی INF.
٦٥٤- ئاماژەیەک یان وەلامێک لە DEVICE هەیە لەفایلی INF بەلام ماکرۆ نەناسراوە.
٦٥٥- نەیتوانی ماکرۆ لە (MESSAGE) بدۆزێتەوە لە پارچەی DEVICE لەفایلی INF
٦٥٦- ماکرۆ لە (DEFAULOFF) هەیە لەپارچەی DEVICE لە فایلی INF
٦٥٧- ببورە فایلی INF بکەرەوە تایبەت بە ئامێرەکەت.
٦٥٨- گرنگ نیە تا ٦٦٤
٦٦٥- مودێم ناتوانێت پەیوەندی ببەستێت بەشێوەیەکی تەواو.

باوکی ماریا — شەقڵاوە
Kameran7605@yahoo.com

# ناردنی مەلەفی دەنگی (sound file) لەنێو تۆڕی ئینتەرنێت




وێنەی (١)

هەموومان دەزانین کە لەتواناماندا هەیە مەلەفیکی دەنگی یاخود مۆسیقا وەربگرین یاخود بنێرین لەڕێی تۆڕی ئنتەرنێتەوە، بەڵام تەکنەلۆژیای بەکارهێنراو چی یە لە ناردن و وەرگرتن و پەستانی ئەم مەلەفانە ؟، بۆ ئەوەی بتوانین بینێرین لە کۆمپیوتەرێکەوە بۆ کۆمپیوتەرێکی تر .

پێش چەند ساڵێک ئەمان دەتوانی مەلەفیکی دەنگی بنێرین یاخود گوێ ی لێ بگرین لە ڕێ ی ئنتەرنێت، ئەویش بەهۆی قورسی مەلەفەکان بە بوونی زانیاری زۆر لەسەری، کە هێڵی تەلەفۆن ناتوانی بەخێرایی وروونی بینێرێت، لەو کاتەوە چەندین کۆمپانیا بیریان کردەوە لەوەی ئەگەر بتوانرێ قەبارەی مەلەفە دەنگیەکان کەم بکرێتەوە، ئەوا دەتوانین ئەم مەلەفانە بنێرین لەڕێ ی مۆدەم و هێڵی تەلەفۆنی تەقلیدی، بێ گومان ئێمە دەزانین کەوا تەکنەلۆژیای بەکارهێنراو لەمەلەفەکانی دەنگی MP3 بریتی یە لە پەستانی داتاکان و کەم کردنەوەی قەبارەی مەلەفەکە، ئەویش بەلابردنی نەرمە دەنگەکان کە ئێمە گوێمان لێ نابێت لەکاتی کارپێکردنی مەلەفە دەنگیەکە، هەرچەند قەبارەی مەلەفە دەنگیەکە کەم بکەینەوە بەم کردارە، ئەوا دەتوانین زۆربە ئاسانی ئەم مەلەفە بنێرین لە ڕێی تۆڕی ئنتەرنێت، بەبەکارهێنانی مۆدەم، بەڵام مەلەفە دەنگیەکان ناتوانرێ پێک بهێنرێت یاخود بخوێنرێتەوە یان گوێ ی لێ ڕاگرین، تەنها بەهۆی بەرنامەیەکی تایبەتەوە نەبێت، وە چەندین بەرنامە هەن بۆ کرداری تەشفیرکردنی ئەم مەلەفانە ENCODERS وە بەرنامەکانی شیکردنەوە DECODERS وە کارپێکردن PLAYERS (واتە کارپێکردنی مەلەفە دەنگیەکە)، وە لەبەناوبانگترین ئەم بەرنامانە وەکو دەزانین بەرنامەی REAL AUDIO بوو کە بەکارهێنرا لەساڵی ١٩٩٤، وە دوایی گەشەی پێکرا بۆ REAL VIDEO کە ئێستا ناسراوە بە REAL PLAYER، کە دەتوانین زۆر بەئاسانی دای بەزێنین لە سایتی کۆمپانیاکە کە ناونیشانەکەی بریتی یە لە WWW.REAL.COM، بەڵام بەرنامەی REAL PLAYER بێ ڕکابەر نی یە چونکە بیل گێتس ڕازی نابێت کەسێک لە غەیری خۆی لە ساحەکەدا بێت، لەبەرئەوە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت هەڵسا بەدانانی بەرنامەی WINDOWS MEDIA PLAYER کە لەگەڵ سیستەمی ویندۆز دادەبەزێت.

هەموومان دەزانین دەربارەی زیادکردنی وێنەوگرافیک بۆ فایلی وۆرد (WORD DOCUMENT)، بەڵام ئایا دەزانین کە دەتوانین مەلەفی دەنگیش زیادبکەین بۆ مەلەفیکی وۆرد؟

ئەگەر دەتەوێ ئەم کردارە ئەنجام بدەیت ئەوا زۆر ئاسانە، وە ئەم ڕێگایە بگرە بەر:-

١- هەڵسە بەتۆمارکردنی مەلەفیکی دەنگی بەدەنگی خۆت، ئەویش بەم ڕێگایەی خوارەوە:-

لە لیستی START بڕۆ بۆ ALL PROGRAMS دوایی ACCESSORIES وەپاشان ENTERTAINMENT وە SOUND RECORDER هەڵبژێرە، پاشان دەست بە تۆمارکردنی دەنگەکە بکە وە خەزنی بکە بەناوێکەوە (وێنەی ژمارە ١).

٢- هەڵسە بەکردنەوەی بەرنامەی وۆرد وە کارسەری ماوس لەو شوێنە




Object

Create New | Create from File

File name:

ıts and Settings\kameran khoshnaw\Desktop\shaqlawa.wav

Browse...

کلیکی ئێرە دەکەین بۆ هێنانی مەلەفە دەنگیەکە بۆ ناو بەرنامەی وۆرد

Link to file

Display as icon

Result

Inserts the contents of the file into your document so that you can edit it later using the application which created the source file.

OK | Cancel

kameran7605@yahoo.com

وێنەی (٢)




وێنەی (٣)

دابنێ کە دەتەوێ مەلەفە دەنگیەکەی بۆ زیادبکەین.

٣- لە لیستی INSERT فەرمانی OBJECT هەڵبژێرە، دەبینین شاشەیەکمان بۆ دەکرێتەوە وە CREATE FROM FILE دیاری دەکەین وە کلیکی BROWS دەکەین بۆ هێنانی مەلەفە دەنگیەکە وە OK دەکەین (وێنەی ژمارە ٢).

٤- دەبینین مەلەفەکە زیاد بووە بۆ سەر دیکۆمێنتەکە (وێنەی ژمارە ٣).

٥- ئەگەر بتەوێ گوێ لەمەلەفەکە راگری، ئەوا دوو کلیکی لەسەر بکە، وە بەتەئکید دەتوانی ئەم مەلەفە بنێری لە رێ ی نامەی ئەلیکترۆنی بۆ کەسێکی تر، وە کەسەکە دەتوانی نامەکە بخوێنێتەوە وە گوێ ی لە قسەکانی تۆش بێت .

# گۆڕینی پاسۆرد لە پۆستی ئەلیکترۆنی یاهوو

حسن عمر

لەبەر ڕۆشنایی بابەتێکی پێشوی ئەم گۆڤارە دەربارەی پاراستنی ئیمێلەکانمان و بۆ زیاتر ئاشنا بوون بە کاری گۆڕینی پاس ۆورد لە پۆستی ئەلیکترۆنی یاهودا بۆ ئەوەی هەرکاتێک ویستمان یان پێویستمان بوو بیگۆڕین یان لەبەر هەر هۆیەک بێت وشەی نهێنی ئیمەیل بگۆڕێت پێویستە هەنگاوەکان بە وردی بزانین تاکو ئەم ئیمەیلەمان لەدەست نەچێت و بتوانین بە شێوەیەکی دروست بیپارێزین جا ماڵپەڕێکی وەکو یاهۆۆ بەملیۆنەها بەشدار بوی هەیەو یەکێکە لە ماڵپەڕە گەورەکانی بەخشینی ئیمەیل بەخۆڕایی و بەقەبارەیەکی گەورە کەنزیکەی یەک گێگا بایت دەبێت لەهەمان کاتدا گۆڕینی وشەی نهێنی تێیدا ئاسانە بڕوانە



وێنەی (١)



وێنەی (٢)

Yahoo! Help - Sign-in and Registration - Microsoft Internet Explorer

YAHOO! Yahoo! Home - Account Info

**Sign-in and Registration Help**

Sign-in and Registration > Sign-in and Registration Help >

**Related Links**
- Sign-in and Registration Help

**Further Reading**
- More on Yahoo!

**ID/Password Help**
- Change Your Password
- Request New Password
- Yahoo! ID Recovery

**Have a question about Sign-in and Registration?**

Ask Yahoo! Help.

**What if I forgot my password?**

If you're having trouble with your password or have forgotten it, get a new password here.

On this form, you'll need to enter your exact Yahoo! ID, your birthday, and the ZIP or postal code you provided when you registered for the account. After we confirm this information, you can choose to obtain your new password in one of two ways:

- **Display new password on-screen:** If you chose an identifying question at registration, you can enter the answer here to verify your identity. Once you have answered the question correctly, your new password will be displayed on-screen.

وێنەی (٣)




وێنەی (٤)

هەنگاوەکانی گۆڕینی وشەی نهێنی:

لەدوای کردنەوەی پۆستی تایبەتی خۆت لە ماڵپەڕی یاهۆ دواتر لەبەشی ڕاستی لاپەڕەکەدا لەلای سەرەوەی وەک لەوێنەی (١) ئاماژەی بۆکراوە کلیک لەسەر (HELP) دەکەین دواتر پەڕەیەکی تر دێت بڕوانە وێنەی (٢) لەلای چەپیەوە چەند هەڵبژاردەیەک هەیە لەوانە کلیک لەسەر (WHAT IF FORGOT MY PASSWORD) دەکەین دواتر پەڕەیەکی تر دەکرێتەوە ڕاستەوخۆ کلیک لەسەر (CHANGE YOUR PASSWORD) بڕوانە وێنەی (٣) دەکەین دوای ئەمەش پەڕەیەکی تر دەکرێتەوە لەمەیان بۆکسێک دێت داوای دانانی پاس وۆردی کۆن و دوجار نوسینی پاس ۆوردی نوێت لێدەکات و لەدوایدا کلیک لەسەر (SAVE) دەکەین چاوەڕێدەکەین تا کردارەکە تەواو دەبێت بڕوانە وێنەی (٤).

# گەڕان لە Google و Yahoo لە یەک کاتدا!!

ئا: دیار عزیز

پاش ئەو کێبڕکێیە توندەی کە هەردوو گەورە کۆمپانیا لەبواری گەڕان لە ئەنتەرنێتدا بەخۆیانەوە بینی بەتایبەتی دوای ڕاگەیاندنی قەبارەی گەڕان لەلایەن هەردوو کۆمپانیاکە بۆ ڕاکێشانی زۆرترین بەکارهێنەر بۆ خۆیانەوە، لەم دواییەدا ئەم دوو کۆمپانیا بەناوبانگەی ئنتەرنێت لەچوارچێوەی پلانێکی نوێ بۆ پێشکەشکردنی باشترین خزمەتگوزاری بۆ بەکارهێنەران لەبواری گەڕان و هاریکاری هاوبەش لەنێوان خۆیان و کۆمپانیا جۆراو جۆرەکانی گەڕان




وێنەی (١)

هەڵسان بە پێشکەشکردنی سایتێکی نوێی هاوبەش بە بەکارهێنەران بەناوی (WWW. GAHOOYOOGLE.COM) تایبەتمەندی ئەم سایتە لەوە دایە کە لەکاتی کردنەوەی سایتەکە لاپەڕەکە دەبێتە دوو بەش تیایدا هەردوو سایتی تایبەت بەم دوو کۆمپانیایە لەیەک کاتدا نیشان دەدات کە دەتوانرێ بەهۆیەوە لەکاتی سێرچ کردندا لەیەک کاتدا لەهەردوو سایتی GOOGLE و YAHOO بگەڕێی بۆ دەست کەوتنی زۆرترین ئەنجام لەو بابەتەی کە گەڕانی بۆ ئەنجام دەدەیت.

سەرچاوە : سایتی (المحیط)




وێنەی (٢)

# چۆنیەتی داخڵ کردنی تراکی دەنگ بۆناو کۆمپیوتەر

ئا: هێرش

وێنەی (١)

دەتوانی ئەم کردارە بەچەند شێوەیەک ئەنجامی بدەیت بە ویندۆز میدیا پلەیەر و بەرنامەی نیرۆ و چەند شتی تر بەلام ناتوانی راستەو خۆ تراکێکی دەنگ بخەیتە ناو کۆمپیوتەر یان گۆرانیەکی دەنگ لەبەرئەوەی پاش داخیل کردنەکە ئەگەر بێت و تراکەکە بکەینەوە دەبینین کار ناکات لێرەدا باسی بەرنامەی نیرۆ NERO دەکەین کەدەتوانێت تراکێکی دەنگ بخاتە ناو کۆمپیوتەر لەهەمان کاتدا تراکەکە کاربکات.

## چۆنیەتی کارکردن

سەرەتا باس لەو بەرنامەیە دەکەین کەچەند مۆدێلێکی هەیە واتا VERSIONێکی کۆن و نوێی هەیە بەلام بەلام ئەو کارەی ئێمە باسی دەکەین لە ڤێرژنی نوێ و کۆن جیاوازێکی زۆی نیە بۆنمونە ڤێرژنە کۆنەکان ونوێکان پاش کردنەوەیان لەسەرەوەی بەرنامەکە چەند نوسراوێک هەیە وەک - FILE - EDIT- VIEW -RECORDER- EXTRAS WINDOW –HELD (وێنە ١) سەرەتا دێین باس لە ڤێرژنە کۆنەکانی نیرۆ دەکەین دێینە سەر RECORDER کلیکی لەسەر دەکەین بەماوس لیستێکی نوێ دەکەوێتە بەرچاو بەم شێوەیە (وێنە ٢) هەر لەم لیستەوە لیستێکی تردێت کەئەمانەی تێدا نووسراوە - CHOOSE RECORDER MEDIUM-INFO – SAVE TRAKS و هتد. بەماوس کلیک لەسەر SAVE TRAKS دەکەین دولیستی جیاواز لەدوو یەکتر دێن هەردووکیان بەماوس لادەبەین تاکو ئەم لیستە دەکەوێتە بەرچاو (وێنە٣)



وێنەی (٢)




وێنەی (٣)




وێنەی (٤)

بەلام لەکاتی ئەنجامدانی ئەم کارانە دەبێت سیدییە دەنگەکە لەناو سیدی رۆم بێت ئینجا هەموو تراکەکان دەکەونە بەرچاو وەک لە (وێنە ٣) دیارە ئینجا کام تراکەمان بوێت دەست نیشانی دەکەین ئینجا GO لێدەدەین تراکەکە دەچێتە ناو کۆمپیوتەر هەروەها لەبۆشاییەکەی خوارەوە پێت دەڵی بەچی جۆرە فایلێک دەنگەکان خەزن دەکەیت (وێنە ٤).

# دانانی زیاتر لە ١٠٠٠٠ شێوە بۆ ئاراستەی ماوس




وێنەی (١)

## سۆزیار کامیار - سلێمانی

دیارە بەکار هێنانی کۆمپیوتەریش زەوق و هونەری تێدایە زۆرجار بۆ ئەوەی ئارەزوو بکەیت لە کار کردن لەسەر کۆمپیوتەر بۆ ماوەیەکی درێژ بەبێ ئەوەی هەست بە هیلاکی بکەیت یان وەرەست بکات ڕوکاری کۆمپیوتەرەکەت بە چەندەها شێوە دەڕازێنیەوە لەگەڵیشیان ماوس یان ئاراستەی ماوس واتە لە گەڵ جوڵاندن یان کار کردنی ئەم ماوسە شێوەو شکلێک وەرگرێت کە هەم جوانی دەبەخشێت هەم زەوق دەداتە بەکارهێنەر . بۆ نمونە هەندێک لەم جوانکاری و شێوانە بریتین لە بەفر بارین یان دەرکەوتنی کومەلێک ئەستێرە یان دەرکەوتنی دەستێک لەسەر شێوەیەی دەستێکی سروشتی یان دروست بونی پەلکە زێرینە هتد. ناوی ئەم بەرنامەیە بریتیە لە (CURSORXP) . وێنەی (١) روکاری بەرنامەکەیە. لە هەمان کاتدا بەکارهێنانی زۆر ئاسانە بۆ گۆرینی شکلی ئاراستەی ماوسەکەت بۆ ئەو شێوەی کە بەخۆت حەزی پێدەکەیت ئەوا لە شوێنی (SCHEME) کلیک دەکەیت یەکسەر لیستێک درێژ دەبێتەوە تۆش یەکیان دەست نیشان دەکەیت دواتر لەبەشی ژێرەوەی یەک کلیک دەکەیت کامە شێوەت لا جوان بێت هەڵیدەبژێریت. بڕوانە وێنەی (٢) خۆم شێوەی دەستم هەڵبژاردووە تۆش کامەت بەدڵە هەڵیبژێرە دواتر لەکۆتایی (OK) بکە.




وێنەی (٢)

# بچووک کردنەوەی قەبارەی (Video, Audio) لەبەرنامەی Nokia Multimedia Converter


ئا: شوان صابر

Shwan_Tatlises@yahoo.com


سەرەتا دوای کردنەوەی بەرنامەکە وەک لە (وێنەی ژمارە ١) دیارە دەچین بۆ لیستەی File و Open هەڵدەبژێرین وەک لە (وێنەی ژمارە ٢) ئەو فایلەی مەبەستمانە دەیکەینەوە (دەنگی بێت یان دەنگ و رەنگ) دوای ئەوە ئەگەر بمانەوێت بچووکی بکەینەوە ئەوا دەبێت کلیک لەسەر دووگمەی (Convert) دەکەین وەک لە (وێنەی ژمارە ٣) دوای ئەوە شوێنێک دەست نیشان دەکەین و ناوێک بۆ فایلەکە دەنووسین و کلیک




وێنەی (١)




وێنەی (٢)




وێنەی (٣)

لەسەر دووگمەی (Save) دەکەین و چەند چرکەیەک چاوەڕێ دەکەین وەک لە (وێنەی ژمارە ٤) دیارە دوای ئەوە کارەکەمان بە سەر کەوتوویی تەواو دەبێت:

تێبینی: ئەو فایلەی بەم بەرنامەیە بە بەرنامەی (Windows Media Player) کاردەکات بەڵام بە (Real Player) کارناکات.




وێنەی (٤)

# کوکیز cookies

ئاشنا فواد

بونی تایبەتمەندی مەلەفاتی کوکیز و کارەکانی لە بەرنامەکانی پەرە هەڵدەرەوەکانی ویب زۆر گرنگە چونکە لەلایەک هەموو ماڵپەرەکان لەگەڵی کاردەکەن و لە هەمان کاتدا کار کردنیش لە بەرژەوەندی بەکارهێنەرەکانی ئنتەرنێتە چونکە هەڵدەستی بە یارمەتی دانی بەکارهێنەری ئنتەرنێت لە کردنەوەی ماڵپەرەکان یان لە نوسینی ناوو پاس وۆرد چونکە ئەم کوکیزە فەرمانی کۆگا کردنی کاتیە بۆ گشت ئەو کارانەی کەسەکە لەسەر ئنتەرنێت دەکات لەناویشیاندا پاسۆردەکان تاکو



وێنەی (١)

ئەگەر بەکارهێنەر جارێکی تر پێویستی بە هەمان پاس وۆرد هەبوو ئەوا لە کوکیزدا ماوە. بەلام ئەم بەشەی پەرە هەڵدەرەوەکان زیانیشی هەیە بۆ ئەو کۆمپیوتەرانەی زیاتر لەیەک کەس کاری لەسەر دەکات چونکە دەبێتە هۆی دزینی ناوو پاس وۆرد بۆیە پێویستە ئێمە لەم کردارە بە ئاگا بین، وەکو لە ژمارەکان (٦) باسی پاراستنی پاس وۆردی پۆستەکانمان کردووە ئێستا دوای ئەوەی زانیاریەکی بچوکمان لەسەر کوکیز وەرگرت دەتوانیت تایبەت مەندی خەزن کردنی پاس وۆرد لابەرین ئەویش لەرێگای کۆنترۆل پەناڵەوە دەچینە سەر (INTERNET OPTIONS) دوایی (CONTENT) هەڵدەبژێرین بروانە وێنەی (١) دواتر بۆکسێک دەکریتەوە ئێمە (AUTOCOMPLETE) کلیک دەکەین بروانە وێنەی (٢) بۆ کسێکی تر دەکرێتەوە وەکو لەوێنەی (٢) دیارە بە لابردنی ئاراستەی هەر یەک لەم هەڵبژاردانە ئەوا فەرمانەکەی لە کار دەخرێت بۆ نمونە ئەگەر ویستمان پاس وۆرد خەزن نەبێت ئەوا ئاراستەی (PROMPT ME TO SAVE PASSWORDS) لادەبەین یان ئەگەر ویستمان ناوو پاس وۆردمان خەزن نەبێت ئەوا (USERS NAME AND PASSWORD ON FORMS) ئاراستەی بەردەمی لادەبەین. یان هەر تایبەت مەندی تر کە دەتەوێت نەمێنێت وەک دیار نەمانی هەر ماڵپەرێک کە تۆ سەردانت کردوون.



وێنەی (٢)



# بەکارهێنانی بەرنامەی POWER CINEMA لەجیاتی MIDIA PLAER

ئا: دارا محمد

ئەم بەرنامەیە زۆر بەئاسـانی هەموو شوێن و جۆری فایلی ڤیدۆیی و دەنگی وە جۆرەها فایلی تر بۆمان دەکاتەوە




وەهەروەها ئەو ئەو داتایەی دەنگ بێ ئەوا لەبەشی دەنگ دەبێ




وە ئەگەر فایلەکە وێنەبێ لەفایلی وێنەکە دا دەبینین.




وەئەگەر فایلەکە ڤیدۆیی بێ ئەوا لەفایلی ڤیدۆیی دەبێتەوە.



# بەهۆی بەرنامەی 3DNA سیستەمی کۆمپیوتەرەکەت دەبێتە یاری

ئا: هەژار کاروان

ئازیزان خۆشەویستان بەرنامەی3DNA روخساری وێنەی کۆمپیوتەرەکەت دەبێتەیاری وەک:




بەهۆی ئاراستەکان کەلەسەر کیبۆردەکەهەیە بەرەو پێشەوە دەڕۆیین تاوەکو ناو کۆگاکە.




وە دەبینین کە هەموو ئایکۆنەکانی کۆمپیوتەرەکە بەشێوەی یاری پێشانمان دەدات وە دەچینە سەر ئایکونی مای کۆمپیوتەر.




وە کە کلیکی ماوسەکە ئاراستەی سەر ئایکۆنەکان پێمان نیشان دەدات کە ئەم ئایکۆنە چ بەشێکی ویندۆزەکەیە.







وەهەروەها ئەگەر هاردی کۆمپیوتەرەکە چەند پارتشن بێت واتە چەند بەشبێت ئەوا ئەوەندە دەرگایە دەبێت لەناویاریەکەدا.

